


زنجیرە کتێبی برایان ترەیسی بۆ سەرکەوتن

# MOTIVATION

# هاندان

برایان ترەیسی

وەرگێڕانی: ژۆژک ئومێد






238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

📚 پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان
drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_







    

## پێناسی کتێب

- ناوی کتێب: هاندان
- نووسەر: برایان ترەیسی
- وەرگێڕانی: زۆزك ئومێد
- بابەت: گەشەپێدانی مرۆیی
- چاپخانە: تاران
- چاپی یەکەم: ٢٠١٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٢٥٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(١٨٥٧) ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە



# پێڕست

# پێشەکی

بەنرخترین و گەورەترین سەرچاوەی هەر دەزگایەك کارمەندەکانیەتی. گەورەترین توانای گەشەسەندن، بەرهەمهێنان، ئەداکردن، بەدەستهێنان و قازانجکردن لە کارامەی و تواناکانی کەسێکی ئاسایدا خۆی دەبینێتەوە، لەم کتێبەدا یەکێك لە گرنگترین فرمانەکانی بەڕێوەبردن فێردەبیت، ئەویش هاندانی کەسانی دیکەیە بۆ پێشکەشکردنی لوتکەی ئاستیان. فێری چۆنیەتی بەکارهێنانی بیرۆکەگەلێت دەبیت کە لە ٥٠ساڵی رابردوودا دۆزراوەتەوە بۆ تواناداركردنی خەڵك لە پێشکەشکردنی ئەوپەڕی تواناکانیان لەپێناو دەزگاکەدا.

ئەو شتەی دەیزانین ئەوەیە، کە ئێمە ناتوانین خەڵکی هان بدەین، بەڵام دەتوانین ئەو شتانە لاببەین کە بووە بە ڕێگر لەوەی خۆیان هانی خودی خۆیان بدەن. باشترین هاندان ئەوەیە خۆت هانی خۆت بدەیت. وەکوو بەڕێوەبەرێك دەتوانی ژینگەیەکی وا دروست بکەیت کە توانای هاندانی خۆیی بەشێوەیەکی سروشتی و خۆبەخۆیانە چەکەرە بکات.

بەپێی ڕۆبێرت هاف و هاوکارەکانی کەسێکی ئاسایی لە سەدا ٥٠٪ ی تواناکانی بەکار دەهێنێت. لە سەدا ٥٠٪ ەکەی دیکەی کارکردنی ڕۆژانەی لە قسەکردن لەگەڵ کارمەندانی دیکە بەفیڕۆ دەدات، یاخود لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت، درەنگ هاتن بۆ سەر کار، زوو بەجێهێشتنی کار، کاتی زیاد وەرگرتن لە ژەمی نیوەڕواندا و ڕاپەڕاندنی کارە کەسێتییەکانی خۆیدا بەفیڕۆی دەدات.

هۆکاری سەرەکی ئەم کات بەفیڕۆدانە، کە یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی نەزۆککردنی ئابووریی دەزگاکان، هان نەدانیان و نەبوونی تەرکیزی پێویستە لەسەر کارەکە، ئەوەندە ئامادە و ئاراستە نەکراون هەتا کاری دەزگاکەیان لەپێش هەموو کارەکانی دییەوە بەئەنجام بگەیەنن، ئەمەیش ئاستەنگێکە کە بەڕێوبەری باش دەتوانێ چارەسەری بکات.

## له سەدا پەنجا بەکارنەهاتوەکە بخەرە کار

کاری تۆ بەکارهێنانی لە سەدا پەنجا بەکارنەهاتووەکەیە، کە کۆمپانیا پارەت پێ دەدات بۆ کردنی وە هەروەها بەکاربردنی ئەو کات و وزەیە بۆ بەرهەمهێنانێکی زیاتر و کارێکی باشتر.

مەبەستی بازرگانی بەرپاکردنی ئەوپەڕی دادپەروەرییە لەو دەستمایەی، کە دەستی کەوتووە. ئامانجی بەڕێوەبردنیش بەدەستهێنانی زۆرترین وزەی کارکردنە لە لایان کەسانێکەوە لەوێ کار دەکەن. دەستمایەی ئابووری بە دۆلار دەپێورێت، دەستمایەی مرۆڤیش بریتیە لە وزەی دەروونیی و جەستەییی و سۆزداریی تاك. کاری تۆ وەکوو بەڕێوەبەرێك پەرەپێدانە بەو دەستمایە و تەرکیزە مرۆییە لەپێناو بەدەستهێنانی بەنرخترین و گرنگترین ئەنجامانێك، کە ئەگەری هەیە دەزگاکەت بەدەستی بهێنێت.

## هۆکارە دڵساردکەرەوەکان لاببە

دوو هۆکاری سەرەکی دڵساردکردنەوە لە ژیان و کاردا هەن، هەردووکیان پاڵنەرانێکن، کە هەر سەرەتای منداڵییەوە دەست پێ دەکەن و درێژ دەبنەوە بۆ نێو ژیانی هەرزەکاری، ئەوانەیش ناودەبرێن بە خوگرتن بە شێوازێکی نەرێنی و وەڵامدانەوەیەکی مەرجدارککراو بۆ هاندەرێك.

یەکەم هۆکاری دڵساردکردنەوە ترسانە لە شکست. ئەمە گەورەترین بەربەستە لەبەردەم سەرکەوتن و بەدەستهێنان لە ژیانی هەرزەکاریدا. لەبەر ئەو ڕەخنە ڕوخێنەرانەی، کە لە ژیانی منداڵیاندا لەهەرزەکاران گیراوە، کە گەورەدەبن دەترسن لەوەی هەڵەیەك ئەنجام بدەن یاخود لە کارەکانیاندا شکست بخۆن، ئەم ترسە وەکوو ئیفلیجیەك وایە بۆ هەرزەکاران، کە وادەکات نەوێرن سەرکێشییەك ئەنجام بدەن و پێشوازی بکەن لە لێپرسراوییەتییە نوێیەکانیان یان تواناکانی خۆیان برەو پێ بدەن. ترسان لە شکستخواردن بەردەوام دەبێتە هۆی دروستکردنی بیانوو و هۆکارگەلێك بۆ نەکردنی کارێك.

هۆکارێکی تری گەورەی دڵساردکردنەوە ترسانە لە ڕەتکردنەوە. ئەم کۆسپەش لەو کاتەوە دەست پێ دەکات، کە خێزان "خۆشەویستییەکی مەرجدار" دەدەن بە منداڵەکانیان. ئەو کاتە پشتی منداڵەکانیان دەگرن و خۆشیان دەوێت، کە کارێکی باش ئەنجام بدەن. دوای ئەوەی منداڵەکە گەورە بوو ئێجگار هەستیان دەبێت بە بیرۆکە و تێبینی و بۆچوونی کەسانی دی، بەتایبەتیش بەڕێوەبەری شوێن کارەکەیان.

ترسان لە ڕەتکردنەوە ترسانیشە لە ڕەخنە و لۆمە و تاوانبارکردن- ترسانە لە کردنی هەڵەیەك، کە ببێتە مایەی دەرکردنی لە کارەکەی. بەڕێوەبەرە سەرکەوتووەکان ئەوانەن کە " وەرگرتنێکی بێمەرج" بەکار دەهێنن لەگەڵ کارمەندەکانیان و وادەکەن گشت کارمەندەکان هەست بە ئاسوودەیی و پارێزراوی بکەن لەگەڵ کار و بەڕێوەبەرەکەیاندا.

## ترس بکەرە دەرەوە

هۆکـــارانێکی زۆر هــــەن بـــۆ دڵســـاردکردنەوە و ئـەداکردنێکی خـراپ، بـەڵام ئـەم دوو هۆکـارە سـەرەکییە ڕێگرن لەوەی کەسەکان تواناکانی خۆیان بەرەو پێ بدەن بۆ کردنی باشترین کارانێك، کە دەتـوانن ئـەنجامی بدەن. باشترین بەڕێوەبەر و دەزگاکـان ئەوانـەن کـە هۆشـیارانە و ئەنقەسـتانە کـار دەکـەن بـۆ لابردنـی ئـەم بەربەسـتانە، بەئاســایی وەری دەگــرن ئەگــەر شکســت بهێنێــت یـان هەڵەیەك ئەنجام بدەیت، ئەوەش ڕوون دەکەنەوە کە کەس لەبەر کردنی هەڵەیەك دەرناکرێت و لۆمـە ناکرێت و سزای نادرێــت و ناترســێندرێت. بەڕێوەبــەرە ســەرکەوتووەکان ژینگەیــەك دروســت دەکــەن ئازادانــە کەســەکان بتــوانن باشترین ئەنجام بدەن.

و. ئێـدواردس دێمیـنگ، کـە بـە بـاوکی بـەڕێوەبردنی جۆرایـەتیی گشـتی نـاوی دەرکـردووە، گـوتی، یـەکێك لـە چـواردە کلیلـەکانی بنیادنـانی دەزگایـەك، کـە ئاسـتی ئـەداکردنی بـەرزە بریتییـە لـە " تـرس بکـەرە دەرەوە".

کاتێك ترس نەبێت کەسەکان کارەکانیان و بەرهەمەکانیان لە ئاستێکی بەرزتردا دەبێت دەبێت لەوەی پێشوتریان.

لەم کتێبەدا فێری زنجیرەیەك لە تەکنیك و ڕێگای کرداری و سەلمێندراو دەبیت، کە دەتوانیت بەکاریانبهێنیت بۆ کەمکردنەوەی ترس لە شکست و ڕەتکردنەوە، وە هەروەها زیادکردنی ئارەزووی کەسێك بۆ ئەنجامدانی شتانێکی تر و وا لە کارمەندەکان بکەیت هەست بە لێهاتوویی خۆیان بکەن کاتێك کارێکت بۆ دەکەن. کەسەکان هەست بە باشبوونی خۆیان دەکەن کاتێك هانبدرێن بۆ سەرکەوتن و کارێکی چڕوپڕتر.

هەر دانەیەك لەم بیرۆکانە بەرهەمی چەندین ساڵ و کار پێکردنن. بەکارهێنانی تەنها یەك لەم بیرۆکانە لە توانایدایە ژینگەیەکی ئاسایی کارکردنت بۆ بگۆڕێت بۆ سەرووتر لە خۆی لەکاتێکی کەمدا.

## پاڵنەری سەرەکی

پاڵنەری سەرەکی هاندان و ئەداکرنێکی بەرز تەنها یەك شتە: ئەویش پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و ئەوەی لەژێر

دەستی ئەو بەڕێوەبەرەدا کار دەکات. ئەوەی کە شوێنی خۆی دەگرێت لە پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەنددا پاڵنەری سەرەکی ئەداکردن، چالاکی، بەرهەمهێنان و قازانجکردنی دەزگایە. لەو خاڵەی، کە دوو کەس پەیوەندی تێدا دەبەستن، بە ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی، خاڵی دیاریکەری ئاستی ئەداکردنی ئێستا و ڕابردوو و داهاتووی تاك و دەزگاکەیە.

کاتێك پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەند ئەرێنی و پاڵپشتیکەرە، ئاستی ئەداکردن و بەرهەمهێنانی تاکەکە دەگاتە لوتکە. ئەگەر پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەند لەبەر هەر هۆیەك نەرێنی بێت ئەوا ئاستی ئەداکردنەکەی دادەبەزێت. پەیوەندییەکی نەرێنی لەگەڵ بەڕێوەبەردا دەبێتە هۆی ترسا لە شکست و ڕەتکردنەوە و قبوڵنەبوون.

بیرۆکەکانی نێو ئەم کتێبە جەخت لەسەر بەرەوپێشبردنی کوالیتیی ئەو پەیوەندییەی نێوان بەڕێوەبەر و ستافەکەی دەکاتەوە. هەموو ئەو شتانەی دەیکەیت بۆ باشترکردنی ئەم پەیوەندییە دەبێتە هۆی

باشترکردنی تەواوی کوالێتیی کارەکەت، بەبێ گوێدانە ئەوەی لە چ پلەیەکی بەڕێوەبردندایت.

کۆتا خاڵ پێش ئەوەی دەست پێ بکەین، وەکوو ئەنیشتاین گوتویەتی" هیچ ڕوونادات هەتا شتێك نەجوولێت". بەهەمان شێوە هیچ ڕوونادات هەتا کەسێك نەجوولێت، وە هیچکام لەم بیرۆکانە سوودیان نابێت هەتا ئەو کاتەی کاری پێ دەکەیت وەکوو ئارەزوویەکی خۆت و هەتا کاتت لەبەردەست ماوە.

بەڕێوەبەرە کاریگەرەکان ئەوانەن، کە هەمیشە ئامادەن بۆ کارکردن. کاتێك بیرۆکەیەکی باش دەبینن دەمودەست هەوڵی ئەوە دەدەن بیرۆکەکە بخرێتەڕوو و کاری پێ بکرێت. لەبەر ئەوە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا گەر شتێکت بەرچاوان کەوت و هەستت کرد دەبێتە مایەی هاندانی ستافەکەت لە بەرەو پلە بەر ئەوە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا گەر شتێکت بەرچاوان کەوت و هەستت کرد دەبێتە مایەی هاندانی ستافەکەت لە بەرەوپێشبردنی کارەنیاندا ئەوا دوای مەخە و یەکسەر

بیخەرە بواری جێبەجێکردنەوە، هەر لەو کاتەوە سەرسام دەبیت لەو ئەنجامەی بەدەستی دەهێنیت.

# بەشی یەك
# پاڵنەری ئێكس

لــــە كۆتــــاییی ســـــاڵەكانی ١٩٤٠ و ســـــەرەتای ١٩٥٠كانـدا چـەند توێژینەوەیـەك لـە ئـەورووپا لـە لایـەن راوێـژكارەكانی بەڕێوەبردنـەوە بەڕێوەچـوو، توێژینەوەكـە ئاستی دروستكردنی ئۆتۆمـۆبێلی بـەراورد دەكـرد لـەنێوان بـەریتانیا و ئـەڵمانیای رۆژهەڵتـدا. بۆیـان دەركـەوت كـە چالاكترین كۆمپانیاكانی ئەڵمانیا چوار ئەوەنـدەی كۆمپانیا بەریتانییـــەكان بەرهـــەمی هـــەبوو. ســـەرەتا توێـــژەرە بەریتانییەكان لۆمـەی ئـەو جیاوازییانـەیان دەكرد، كـە لـە نێـــوان كۆمپانیاكانـــدا هـــەبوو، بـــەو پێیـــەی كۆمپانیـــا ئەڵمانییەكان هەموو نوێ بوون و لـەدوای جـەنگی دووەمـی جیهانییـــەوە نۆژەنكرابوونـــەوە، بـــەڵام زۆربـــەی كۆمپانیـــا بەریتانییەكان كۆن بوون و ئامێری ساڵانی ١٩٣٠كانیـان بەكاردەهێنا.

بۆ تاقیكردنەوەی بیردۆزەكە هەستان بە بـەراوردكردنی كۆمپانیـــا بەریتانییـــە نوێیـــەكان و كۆمپانیـــا ئەڵمانییـــە

نوێیه‌كان، كه‌ هه‌ردووك هه‌مان جۆر ئۆتۆمبیلیان دروست ده‌كرد، هه‌مان ژماره‌ی كارمه‌ندیان هه‌بوو و هه‌مان ته‌كنه‌لۆجیا و مادده‌یان به‌كارده‌هێنا. بۆیان ده‌ركه‌وت كه‌ باشترین و خراپترین كۆمپانیای هه‌ردوو وڵات هێشتا رێژه‌ی به‌رهه‌مهێنانیان چوار به‌ یه‌ك بوو.

ئه‌و جیاوازییه‌ له‌ به‌رهه‌مهێناندا كه‌ ئیدی نه‌ده‌توانرا به‌ ته‌كنه‌لۆجیا و مادده‌ لێكبدرێته‌وه‌ به‌ " پاڵنه‌ری ئێكس" ناسێندرا. پاڵنه‌ری ئێكس كه‌ ئێستا پێی ده‌گوترێت پاڵنه‌ری سایكۆلۆجی، بوو به‌ شۆڕشێك له‌جیهانی به‌ڕێوه‌به‌ریه‌تیدا كه‌ له‌ شه‌ست ساڵی ڕابردوودا له‌ جیهاندا پێگه‌ی خۆی قایمكردووه‌.

هه‌تا ڕووخانه‌ مه‌زنه‌كه‌ی ساڵی ١٩٣٠ ه‌كان زۆربه‌ی هه‌ره‌زۆری پێشكه‌وتنه‌كانی بواری به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیكردن به‌هۆی به‌ره‌وپێشچوونی ته‌كنه‌لۆجیا، زانست و پرۆسه‌كانی به‌رهه‌مهێنابوون. له‌ جه‌نگی دووه‌می جیهانییه‌وه‌ زۆربه‌ی پێشكه‌وتنه‌كان به‌هۆی جۆری به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی و هۆكاری ده‌روونییه‌وه‌ بوون له‌ سروشتدا. پاڵنه‌ری ئێكس له‌ گشت هۆكاره‌كانی دی زیاتر ڕوونی ده‌كاته‌وه‌، كه‌ بۆ هه‌ندێك

کۆمپانیـا سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێـنن و هەنـدێکیش شکسـت دەهێـنن، وە هۆکـار چییە لـە ٢٠٪ ی کۆمپانیـا سەرکەوتووەکان لە ٨٠٪ قازانج دەکەن و بۆچی باشترین کەسە بەهرەدارەکان لە باشترین کۆمپانیاکان کاردەکەن.

بە بەکارهێنانی پاڵنەرە دەروونییەکان، کـە دیاریکـەری ئاستی بەرهەمهێنان و ئەداکردنن، دەتوانیـت جیاوازییـەکی بەرچـاو دروسـت بکـەیت لـە کاریگەرییەکانتـدا وەکـوو بەڕێوەبەرێك و لە توانای بەدەستهێنانی ئەنجامەکاندا.

## ناوەندی فەرمان

پاڵنەری دەروونی کار لەسەر سادەترین خاڵ دەکات، ئـەویش " هـزری خودییـە ". دۆزینـەوەی هـزری خـودی گرنگترین پێشکەوتنە لەبواری گەشەسەندنی توانای مرۆیـی لە سەدەی بیست و یەکدا.

هزری خودی بنیاتی بـاوەڕ و سیسـتەمی بـەهای تاکـە. هەر لە سەرەتای منداڵییـەوە شـێوە وەردەگرێت و گەشـە دەسێنیت و تێکەڵەیەکـە لـە هـەموو هەسـت و ئـەزموون و بڕیـار و پـەروەردە و گشـت ئـەو ڕووداوانـەی، کـە ژیـانی

کەسێك پێكدەهێنێت هەتا ژیانی ئەمڕۆی. هزری خوودی دیاریکەری ئەوەیە کە کەسەکە چۆن بیر لە خۆی دەکاتەوە، هەستی چۆنە بەرانبەر بە خۆی و چۆن خۆی دەبینێت بەرامبەر شتەکانی دیکە لە دونیادا.

هزری خودی وەکوو ناوەندی فرماندان وایە و کاریگەری لەسەر چەقی بەرهەمهێنان و کەسایەتی هەیە. هەروەها ئەو شتەیە کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئەداکردن و ڕەفتار و بەرهەمی تاکەوە. هەموو گۆڕان و پێشکەوتنە دەرەکییەکان بە پێشکەوتن لە هزری خودییەوە دەست پێ دەکات. بە مانایەکی تر، هەموو گۆڕانەکانی تاك لە جیهانی دەرەوەدا لە گۆڕان لە جیهانی ناوەکیی کەسەکەوە دەست پێ دەکات.

## هزری خودی و ئەداکردن

هزری خودی لە سێ بەش پێکدێت: وێنەی خودی، ڕێزی خودی و خودی نموونەیی. با بە سەرە باسی هەر یەکێکیان بکەین.

خودی نموونەیی تاك پوختەی ئەو وێنەیەیە، کە مرۆڤ ئارەزوو دەکات لە ژیانیدا بەو شێوەیە بێت. بریتییە لەو نموونە و هیوا و خەون و ئامانجانەی، کە مرۆڤ دەربارەی خۆی هەیەتی، وە ئەوەی دەتوانێت بەدەستی بهێنێت لە داهاتوودا.

لە ژیانی کارکردندا، خودی نموونەیی تاك کاریگەری لەسەر دەکرێت بە چەند شتێك و لەوانەش ئەو ڕۆڵەی، کە کەسە ئەزموونـدارەکان دەیگێڕن لە دەزگاکەدا و کەلتوورێك کارمەندەکە تێیدایەتی.

دووەم بەشی هێزی خودی *وێنەی خودییە.* بیرکردنەوەی کەسێکە کە لە لایەن کەسانی دییەوە چۆن دەبینرێت. کەسێك کەیف و باوەڕی بە خۆی بێت و خۆی لە ئاست شتەکاندا تواناداری ببینێت کارێکی باشتر دەکەن لە چاو کەسانێك کە خۆیان بە باش نازانن کە کارێکدا.

ڕۆژانە مامەڵەی خەڵکی بەرانبەرت کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر وێنەی خودیت. کاتێك خەڵکی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت وەك ئەوەی گرنگ و بەنرخ و ڕێزدار بێت، بەشێوەیەکەی ئەرێنی بیر لە خۆیان

دەکەنەوە و خۆیان دەبینن. لە ئەنجامدا کارێکی باشتر ئەنجام دەدەن و لە ئاستێکی بەرزتردا ئەدا ئەکەن.

بەشی سێیەم و چەقی هێزی خودی، رێزی خودی تاکە. رێزی خودی دەتوانی بەوە لێکی بدەیتەوە کە "چەنێك کەیفت بە خۆت دێت". هەتا کەسەکان زیاتر کەیفیان بەخۆ بێت و رێزی زیاتر لە خۆیان بگرن لە ناخیاندا، باشتر کار دەکەن لە دەرەوە. ئامانجێکی گەورەتر بۆ خۆیان دادەنێن و پێوەرێکی بەرزتر دادەنێن بۆ کارەکانیان. کاتێك خەڵکی کەیفیان بەخۆیان دێت، کەیفیان بە کەسانی تریش دێت و دەبن بە تیمێکی ناوازە.

رێزی خودی " کارلێککەری ناوەکی" کەسایەتیی مرۆڤە، وە دیاریکردنێکی گەورەی وزە، جۆش و خرۆشی، چالاکیی و باوەڕ بەخۆبوونی مرۆڤە.

کلیلی بنیاتنانی دەزگایەکی ئاست بەرز دەگەڕێتەوە بۆ دروستکردنی ژینگەیەك پڕ لە رێزی خودی، ئەمەیش بە لادانی ترس لە شکست و رەتکردنەوە کە لە رەگی داکوتاوە لە کەسایەتیی مرۆڤدا. کاتێك بەڕێوەبەرێك شوێن کارێکی پڕ لە وزەی ئەرێنی و رێزی خوودی بنیات دەنێت،

ئاستی ئەداکردنێکی بەرزی دەبێت، کارمەندەکان کارەکەیان فەرامۆش ناکەن، زیاتر بە گوێی دەکرێت، بەرهەمی زیاتر دەبێت و هەڵەیەکی کەمتر ئەنجام دەدرێت.

## ڕۆڵی بەڕێوەبەر

حەوت ڕێگە هەیە بۆ بنیاتنان و بەهێزکردنی هزرێکی خودی ئەرێنی لە هەر کارمەندێکدا. ئەم ڕامێنانانەش هاوپێچە لەگەڵ حەوت ھاندەردا.

١ .کێبڕکێ: کارێك بدە بە کارمەندەکان کە هیلاکییان بکات، هەتا زیاتر کارمەندەکان ئەزموونی کێبڕکێ بکەن لە کارەکایاندا، زیاتر پەیوەست دەبن پێوەی و ئەرێنییانەتر دەڕواننە خۆیان.

٢ .ئازادی: ئازادییەکی تەواویان بدەرێ بەبێ ئەوەی لە کاتی کارکردندا چاودێری بکرێن، هەتا ئازادیەکی زیاتریان بدەیتێ بۆ ئەوەی لەڕێگەی خۆیانەوە کارەکە بکەن، زیاتر هەست بە باشتربوونی خۆیان دەکەن.

٣.کۆنترۆڵ: کاتێکی دیاریکراو دابنێ بۆ پێداچوونەوە، ڕاوبۆچـوون و بڕیـاردان سـەبارەت بـە کارەکـە. هـەتا ڕاوبۆچوونی زیاتر وەربگیرێت لە کارمەندەکان دەربارەی کارەکەیان، زیاتر هەست بە باشـتربوونی خۆیان دەکەن و زیاتر گرنگی دەدەنە کارەکەیان.

٤.ڕێزگرتن: کاتێ داوای بیرۆکەی خەڵك دەکەیت و لە کـاتێ قسـەکردنیاندا بـەوردی گوێیـان لـێ دەگـری، زیـاتر هەست بە گرنگی و بەهای خۆیا ن دەکەن. کـاتێ بـەوردی گـوێ لـە کەسـانی دیکـە دەگریـت و بـەوریایی بـیر لـە بیرۆکەکانیان دەکەیتەوە، ئەوە پیشـان دەدەیـت، کـە ڕێـز لـە بەهرەمەندییـەکانیان دەگریـت ئەگـەر بیرۆکەکانیشـیان بەکار نەهێنیت.

٥.گـەرموگوڕی: هـەتا کەسـەکان و کارمەنـدەکانی سـتافەکەت زیـاتر ببیـنن، کـە بایـەخ بـە تـاك بـە تاکیـان دەدەیت، باشتر ئەدا دەکەن. کاتێك بـە شـێوەیەك مامەڵە لەگـەڵ کەسـانێکدا دەکـەیت وەك ئـەوەی هاوڕێـت بـن و بەشـێکبن لـە خێزانەکـەت، وایـان لـێ دەکـەیت هەسـت بـە پارێزراوی و گرنگی خۆیان بکەن.

٦. ئەزموونی سەرکەوتن: کلیلی بنیاتنانی هزر و بیری خودی پێدانی کارە بە کەسانێك کە لە ئاستی ئەزموون و کارە مەییەکانیاندایە. کاتێك کە پێدەزانن و هەست دەکەن کە کارێکیان بە ئەنجام گەیاندووە، لە ناخ و دەرەوەی خۆیاندا هەست دەکەن کە ئەمان " براوەن".

٧. بۆچوونی ئەرێنی: هیچ کام لە ھاندەرەکان بەشێوەی بۆچوونی ئەرێنی کاریگەر نییە، وە هیچ شتێکیش وەکوو ئەوە هانی مرۆڤ نادات و ئاستی ئەداکردنی بەرز ناکاتەوە، کە کاتێك هەست دەکات بەڕێوەبەرەکەی باوەڕی بە تواناکانی هەیە بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارەکە.

نهێنیی کۆمپانیا سەرکەوتووەکان دروستکردنی ژینگەیەکە، کە کارمەند پەی بە ناوازەیی خۆی ببات. تێگەیشتن لە ڕۆڵی هزری خودی لە ڕەفتارەکاندا، خاڵی دەسپێکی کاریگەرییە لە هاندان و بەڕێوەبەرایەتیکردندا.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. باش مامەڵەکردن لەگەڵ کارمەنداکانتدا بکە بە خوویەکی خۆت. بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ بکە وەکوو ئەوەی ئەوان زیرەك، گرنگ، بەبەها و بەتوانان. هەوڵ بدە لەهەر پەیوەندییەکت لەگەڵیاندا بەدوای دەرفەتێکدا بگەڕێیت بۆ بنیاتنانی ڕێزی خوودی و باوەڕ بەخۆبوون.

٢. بەردەوام بە کارمەندەکانت بڵێ، کە چەنێك باشن و چەند سەرسامی بە کوالێتیی کارەکانیان. کاتێك بەدڵنیاییەوە چاوەڕێ دەکەی لە کارمەندەکانت ئاستێکی بەرزیان هەبێت، بەدەگمەن بێ هیوات دەکەن.

# بەشی دوو
# کەسی شیاو هەڵبژێرە

هەڵبژاردنی کەسی شیاو خاڵی دەسپێکی سەرکەوتنە لە بەڕێوەبردندا. نزیکەی لە ٩٥٪ ی سەرکەوتنەکانت دەگەڕێتەوە بۆ هەڵبژاردنی کەسە شیاوەکان هەر لە یەکەم جاردا. ئەگەر کەسی نەشیاو کارت بۆ بکات، هەرشتێك بکەیت، هەر تەکنیکێك بەکاربهێنیت و هەر هەوڵێك بدەیت جیاوازییەکی بەرچاوت بۆ دروست نابێت. زۆربەی هەرە زۆری هەڵەکانت وەکوو بەڕێوەبەرێك لە هەڵبژاردنی کەسی نەشیاوەوە یان بوونی کەسێکی نەشیاو لەناو کۆمپانیاکەتدا سەرهەڵ دەدات.

جیم کۆلینس لە کتێبەکەیدا بە ناوی "لە باشەوە بۆ باشترین" پێشنیار دەکات کە کارێکی سەرەکی بەڕێوەبەر "سەرخستنی کەسە شیاوەکانە بۆ ناو پاسەکە و جێگیرکردنی شوێنیان، وە کردنە دەرەوەی کەسە نەشیاوەکانە"

کاتێك لیی لاكۆسكایان هێنا بۆ یارمەتیدانی كۆمپانیای كرایسلەر كە لە ڕۆخی ئیفلاسبووندا بوو، دوای قەرزكردنی ٣٥٠ ملیۆن دۆلار، بۆ ئەوەی بكەونەوە سەر پێی خۆیان و دوایی بیدەنەوە، لاكۆسكا هەستا بە چێكردنی ئەو كەسە پلە بەرزانەی لە كۆمپانیای كلایسلەر كاریان دەكرد، لەماوەی سێ ساڵدا لە ٣٦ جێگری بەڕێوەبەر ٣٥ دانەیانی گۆڕی. لەو كاتەی كە تەواو بوو، بەتەواوەتی ستافێكی نوێی لە كەسە پلە بەرزەكان دانابوو لەنێوانیشیاندا جێبەجێكارانی كارامە و بەئەزموونی لە ئەمەریكا و سەرانسەری جیهاندا تێدابوو.

بە بوونی كەسی شیاو لە شوێنی شیاودا، كرایسلەر هەڵگەڕانەوەیەكی بەرچاوی بەخۆیەوە دیت، لە زەرەركردنەوە سەركەوت بۆ قازانجكردن. كەمتر لە سێ ساڵ لاكۆسكا بەتەواوی ٣٥٠ ملیۆن دۆلارەكەی دایەوە و كۆمپانیای كرایسلەری بۆ جارێكی تر خستەوە ناو كێبڕكێكانی بازاڕەوە.

## بیر لە کارەکە بکەرەوە

دانـــانی کەســـە شـــیاوەکان کلیلـــی ســـەرکەوتنی بەڕێوبەرێتییـە. بیرکردنـەوەی ورد لـە کارەکانـت بکـە بـە دەسپێکەکەت، باشـترە تیـانووس بـەکاربهێنیت بـۆ ئـەو مەبەستە، لیستی ئەو تایبەتمەندی و کوالێتییانـە بنووسـە، کە دەتـەوێت لـە کەسێکدا هـەبێت بـۆ کـارێکی دیـاریکراو. یەکەم شت تـەرکیز بخـەرە سـەر ئـەو ئامانجـە دیـاریکراو و پێوانەییە کە لە کارمەندە نوێیەکەی ڕادەبینیت بەدەستی بهێنێت.

دوای ئەوە بەدوای ئەو لێهاتووە سـەرەتاییانەدا بگـەڕێ کە دەبێت لە کەسەکەدا هەبێت، بۆ ئـەوەی ئـەو ئامانجانـە بەدەســت بهێنێــت کــە کارەکــە پێویســتیەتی. بــەوردی چاوپێکەوتن لەگەڵ کار و یستەکەدا بکـە بـۆ دڵنیابوونـەوە لـەوەی لـە ڕابـردوودا ئـەو کارامەییانـەی پیشـانداوە کـە دیاریت کردوون بۆ کارەکە. وەك پیتـەر درەکـەر وتویـەتی " کارەکانی ڕابـردوو بـە تـەنها دیاریکـەری ڕاسـتی کارەکـانی داهاتوون".

لە کۆتاییدا، چۆن بۆ کارکردن گرنگی دەدەیت بە لێهاتووییەکان، بەو شێوەیەش گرنگی بدە بە هەڵوێست و کەسایەتیی و تایبەتمەندییەکانی کار و پستەکە. دڵنیابەرەوە لەوەی کار و پستەکە لەگەڵ کەلتوور و کارکردندا دەگونجێ، بەهەمان شێوە لەگەڵ خۆت و کارمەندەکانی دیکەشدا. ئەگەر کەسێك هەڵبژێریت کە هەڵوێست و کەسایەتی گونجاو بێت، ئەوە دەتوانی ڕاهێنان و بەڕێوبەرێتی بکەیت هەتا کارێکی باش ئەنجام بدات.

## یاسای "سێ"

بە بەکارهێنانی یاسای سێ، دەتوانی برەو بە تواناکانی خۆت بدەیت لە بواری کارپێدان بە کار و پستەکاندا. لە ڕاستیدا دەتوانی ڕێژەی سەرکەوتنەکانت بگەیەنیتە ٩٠٪ پشتبەست بە ئەزموونی خۆم لەگەڵ هەزاران جێبەجێکار و خاوەن بازرگانیدا. لێرەردا چۆنیەتیی کارکردنەکەی لە شەش هەنگاودا دەخەمە ڕوو.

یەکەم، بەلایەنی کەمەوە چاوپێکەوتن لەگەڵ سێ کارویستدا بکە بۆ کارێك. ئەم جۆرە لە ڕاهێنان فشارێکت دەخاتە سەر، بۆ ئەوەی لە کارەکەتدا هێواشتر بیت و بەراوردی تایبەتمەندیی و کوالێتیی کەسە جیاوازەکان بکەیت.

دووەم ، لە سێ جاری جیاوازدا چاوپێك کەوتن بکە لەگەڵ کارویستەکەدا. لەبیرت بێت کە کار و یست لە یەکەم چاوپێککەوتنیدا زۆر باش دەردەکەوێت. دوای ئەوە بەرەبەرە خراپبوونی دەست پێ دەکات و ڕووی ڕاستەقینەی کەسایەتی دەردەکەوێت.

سێیەم، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کار و یستەدا بکە کە کەیفت پێ دێت لە سێ شوێنی جیاوازدا. لەبەر هەندێ هۆکار، خەڵکی تایبەتمەندییەکی هەیە، کە من بە " قومقومۆکەی ئاڵۆز " ناوی دەبەم. یەکەم جار لە ئۆفیسەکەی خۆتدا بەجۆرێك ڕەفتار دەکەن و دوای ئەوەی خستنە ژینگەیەکی جیاواز کار و کاردانەوەکانیان بە جۆرێکی دی دەبێت.

چـوارەم، ئـەو كـار و پسـتەی، كـە كـەیفت پێـدێت چاوپێککەوتن بکە لەگەڵ سێ لە ئەندامانی تیمەکەت. لە زۆر حاڵەتدا ئەو کار و پستەی بەلای منەوە نموونەیی بووە لـە لایـەن ئەنـدامانی تیمەکـەوە ڕەتکراوەتـەوە، دوایـی دەرکەوت کە کارێکی باشمان کردووە.

## بەوریایی سەرچاوەكان بپشكنە

پێنجەم، بەلایەنی کەمەوە سێ سەرچاوە لـەبارەی كـار و پستەکەتەوە بپشکنە. بەهۆی هەندێ کێشەی یاساییەوە زۆربەی خاوەنکارەکان تەنها ڕۆژی دەستبەکاربوونی كـار و پسـتەکەت پـێ دەدەن، بـەڵام هێشـتا پرسـیارانێك هـەن دەتوانی بیانکەیت، بۆ ئەوەی زانیاریی بەسوود بچنیتەوە. بـۆ نموونـە بـا بڵـێین " ئێمـە چاوپێك كـەوتن لەگـەڵ ئـەم کەسەدا دەکەین بـۆ ئـەم كـار و چـالاکی و لێپرسـراویەتییە دیاریکراوە". دەتوانی هەندێك پرسیاری لەم جۆرە بکەیت"

١. دەتـوانی هەنـدێك لـە خاڵـە لاواز و بـەهێزەکانی ئـەم کەسەم پێ بڵێیت بۆ کردنی ئەم کارە؟

٢.هیچ شتێك هەیە پێمی بڵێیت هەتا من بڕیارێكی باشتر بدەم لە پێدانی كار بەم كەسە؟

٣.ئەگەر جارێكی دیكە كاری ویستەوە لای تۆ وەری دەگریتەوە؟

ئەگەر سەرچاوەی كارویستەكە لەگەڵ ئەم وەڵامانەدا یەكینەگرتەوە، یان هەر وەڵامی پرسیارەكانی یەكەم دووەمی نەدایەوە، ئەوە پرسیاری سێیەم كە پرسیاری گەوهەرییە بكە. ئەگەر وەڵامەكە " بەڵێ" نەبوو، ئەوا پێویستە زۆر وریابیت لە كارپێدان بەم كار و یستە.

سێیەم و كۆتا پارچە لە ئامۆژگاری سێ جار بەقووڵی بیركردنەوەیە لە هەر سەرچاوەیەك. داوای ئەو سەرچاوەیە بكە كە لیستی ئەو كەسانەی تێدایە كە كاریان لەگەڵ كار و یستەكەدا كردووە، بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ ئەوانیشدا بكەیت. كاتێك چاوپێك كەوتن لەگەڵ سێ كەسدا دەكەیت كە ناویان لەو سەرچاوانەدا نییە كە پێت دراوە، هەندێ شت فێردەبیت، كە توشی سەرسوڕمانت دەكات.

زۆرێك لە جێبەجێكاران دوای بەكارهێنانی یاسای سێ پێیان گوتووم كە بەشێوەیەكی بەرچاو كوالێتیی ئەو

کەسانە باش بوون کە کاریان پێدابوون، وە کاریگەری تیمەکە لەسەر کۆمپانیاکە زۆرتر بووە.

## هاوکێشەی سوان (SWAN)

هاوکێشەی سوان چەند ساڵێك لەمەو پێش لە لایەن جێبەجێکارێکەوە بەناوی جۆن سوانەوە پێشنیارکرا. وشەسازییەکی باشە، کە دەتوانی پرۆسەی هەڵبژاردنەکەتی پێ باشتر بکەیت. لە چوار پیت پێکدیت، ئەوانیش S,W,A,N ن.

(S) بەمانای زیرەك"Smart" دێت. کار بدە بە کەسانی زیرەك. چۆن زیرەکی کار و یستێك دیاری دەکەیت؟ وەڵامەکەی زۆر سادەیە، پرسیاری لێ بکە!. کەسانی زیرەك زۆر وریاترن لە کەسانی ئاسایی.

(W) بەمانای بەچڕوپڕی کارکردن"Work hard" دێت. بەدوای کەسانێکدا بگەڕێ، کە ئامادەن کارەکەیان بەچڕوپڕی بکەن، وە هەروەها پاشخانێکیان هەبێت دەری بخات کە ئەم کار و ویستانە بۆ ماوەیەکی زۆر بێ وچان

کاریانکردووە لە کارەکانی پێشوویاندا بەبێ گوێدانە ڕۆژی پشوو و کارکردنی شەوانەیان.

(A) بـــەمانای بەرزوبیســـتی یـــاخود مـــەرام "Ambition" دێـت. کارمەنـدی گونجـاو ئەوەیـە کـە دەیـەوێت لـە ژیانـدا پێشـبکەوێت. کەسـانی بەرزوبیسـت ئامـادەن و بگـرە حەزیشـیان لـە ڕاهێنـانی زیـاترە. ئـەوان دەخوێنن و دەخوێننەوە، وە هەردەم بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕێن بۆ بەرەوپێشبردنی خۆیان و پیشەکەیان.

لەکۆتاییـدا، (N) بەمانای ڕووخۆشـی "Nice" دێـت. ڕووخۆشـی کاریستەکە پاڵنـەرێکی زۆر گرنگـە، وە هەبوونی ئەم تایبەتمەندییە لـە کاریستەکە بەتایبـەتی بـۆ ئەو کەسانە گرنگە، کە بەرکـەوتنیان هەیـە لەگـەڵ خـەڵکی گشـتی یـاخود کڕیارەکانـدا. وەك لیۆنـا هێڵمسـلی کـە لـە ڕیکلامـی هۆتێلەکەیـدا گوتبـووی " ئێمـە کـار نـادەین بـە کەسانێك و دوای ئـەوە ڕاهێنانیـان پـێ بکـەین، بۆ ئـەوەی ڕووخۆش بن، ئێمە کەسانی ڕووخۆش وەردەگرین

لـە کۆتاییـدا، تواناکانـت بـۆ هەڵبـژاردنی کەسـی شیاو کلیی سەرەکی هاندانـە. کاتێـك کارەکـەت نـەدا بـە کەسـی

شیاو ئەوە ناتوانی هانیان بدەیت، بۆ ئەوەی ئاستێکی نموونەیی پێشکەش بکەن لە تیمەکەدا، لەبەر ئەوە دەبێ هەر لە یەکەمجارەوە بەوریایی و لێبڕاوانە هەوڵی ئەوە بدەیت کار بە کەسی شیاو بدەیت.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. ئەو تایبەتمەندییانە دیاری بکە کە لە باشترین کەسانی تیمەکەتدا هەن. دەتوانیت چی بکەیت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا لەو جۆرە کارمەندانە وەربگریت؟

٢. بۆ جاری داهاتوو کارێکت دا بە کەسێك، یاسای سێ بەکار بێنە ڕێك وەکوو ئەوەی لەم بەشەدا باسکراوە، ئەگەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی جێبەجێتکرد، ئەوا ئەم تەکنیکە دووبارە بەکار دەهێنیتەوە.

# بەشی سێ

# بەهێزەوە دەست پێ بکە

لە توێژینەوەیەکدا کە ماوەی سێ ساڵی خایاند، هەر دوو کۆمپانیای ژمێریاریی دیلۆیت و توشێی هەستان بە توێژینەوە لە هەزاران کارمەندی خۆیان، توێژینەوەکە کاری لەسەر دەستبەکاربوونی کارمەندەکان دەکرد هەر لە سەرەتای کارکردنیان لەو شوێنە هەتا چەند ساڵێک دوای دەستبەکاربوونی، ئەمەیش هەوڵێک بوو بۆ دۆزینەوەی ئەو پاڵنەرانەی، کە وا دەکات چاوەڕێی ئەداکردنێکی بەرز ببین لە کارمەندەکانمان. ئەوەی توێژەرەوەکان دۆزیانەوە شتێکی سەرسامکەر بوو.

یەکەم شت، بۆیان دەرکەوت کە هەڵبژاردنی خودی پاڵنەرێکی گرنگە بۆ پێشبینیکردنی ئاستی ئەداکردنی کارمەندەکە لە داهاتوودا. زاراوەی "هەڵبژاردنی خودی" بە واتای ئەوە دێت، کە کارمەندەکە هەڵبژاردەی چەند بەڕێوەبەرێکی لە بەردەمدا بووە. دوای چاوپێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیاکانی تردا، ئەم کارمەندانە کە کەسێکی

کارامــه بــوون و لــه لیســتی ئــه‌و که‌ســانه‌دا بــوون کــه کۆمپانیاکه ڕای لێیـان بـووه، گه‌ڕاونه‌تـه‌وه بۆ دیلۆیت و توشێی و به‌دڵنیایه‌وه لـه قسـه‌کانیاندا گوتویانـه کـه "من ده‌مه‌وێ لێره کار بکه‌م".

به‌شـێوه‌یه‌کی دی، ئـه‌وان خۆیـان بڕیاریـان دابـوو، کـه دیلۆیـت باشـترین کۆمپانیایـه کـه کـاری بـۆ بکـه‌ن، و زۆر سووربوون له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی کـه ده‌بێ ئـه‌و کـاره به‌ده‌ست بهێـنن. ته‌نانـه‌ت دوای تێپـه‌ڕبوونی چـه‌ندین سـاڵیش ئـه‌و کارمه‌ندانـه‌ی کـه خۆیـان کۆمپانیـای دیلۆیـت هه‌ڵبـژاردبوو ئاستێکی باشـتریان پێشـکه‌ش ده‌کـرد له‌چاو ئه‌وانـه‌ی کـه هــه‌ر لــه یه‌کــه‌مجاره‌وه به‌جۆشوخرۆشــه‌وه ده‌ســتیان نه‌کردووه به کاره‌که.

## ئه‌رکێکی زۆریان بخه‌ره‌سه‌ر

دووه‌م پاڵنه‌ر که دۆزییانه‌وه، له هه‌مان کاتدا ناوه‌ڕۆکی ئه‌م به‌شه‌یه، ئه‌و به‌ڕێوه‌به‌رانـه‌ی، کـه ستافه‌که‌یان ئاسـتی ئــه‌داکردنی بــه‌رز بــووه، هــه‌ر لــه یه‌کــه‌م ڕۆژی

دەستبەکاربوونیانەوە کارێکی زۆر و بگرە کاری زیادەشیان داوەتێ.

بەشی یەکەم باسی هزری خودی و ڕۆڵە سەرەکیەکەی دەکرد لە دیاریکردنی کەسایەتی و ڕەفتاری هەرزەکاردا. وەك چۆن هزری خودی هەر تاکێك لەو ئەزموونانەوە دروست دەبێت کە لە سەرەتای منداڵییەوە وەریانگرتووە، بە هەمان شێوە هزری خودی کارمەند بۆ ئاستی ئەداکردن و ڕەفتارکردن لە کارەکەیاندا دەگەڕێتەوە بۆ یەکەم بەرکەوتنیان لەگەڵ کۆمپانیاکەدا. کارمەندە نوێیەکان هەر شتێك یەکەمجار ببینن کاریگەرییان لەسەر دروست دەکات. وە ئەگەر یەکەم بەرکەوتنیان لەگەڵ کارەکەدا پڕ بێت لە ئامانج و لێپرسراویەتی، ئەوا باوەڕی ئەوەیان بۆ دروست دەبێت کە ئەم شوێنە شوێنی کارکردنە لە گزنگی بەیانییەوە هەتا کازیوەی ئێوارە.

لە کۆمپانییاکانی دیکەشدا هەمان حاڵەت بەدی دەکرا، ئەو کارمەندانەی کە هەر لە یەکەم ڕۆژیانەوە کارێکی زۆریان پێ سپێردرابوو، کارمەندی ماندوونەناسیان لێ دەرچوو بوو، وە تەرکیزیشیان لەسەر ئەوە بوو کە

هاوکـــاری زیــاتری کۆمپانیاکــە بکــەن. بەپێچــەوانەوە، توێــژەرەکانی دیلۆیــت و توشــێی دەریانخســت کــە ئــەو کارمەندانەی کاتێکی زۆریان درابوویە، بۆ ئەوەی لەگەڵ کار و هاوکارەکانیاندا ڕابێن، تەنانەت دوای دە ساڵیش لە کارەکانیانــدا هێــواش بــوون و هاوکارییــەکی بەرچــاوی کۆمپانیاکەیان نەدەکرد.

وەک ئــەوەی لــە بەردەممانــدا ڕوودەدات، هانــدەری ژمارە یەک و ئەوەی کە بنچینەی حەزەکانی کارمەندە، ئەوەیــە کــە کارەکــە کێبڕکێکارانــە بێــت. کارمەنــدەکان دەیانــەوێت بــواری ئــەوەیان هــەبێت تواناکــانی خۆیــان بخەنــەڕوو و کێبڕکــێ بکــەن هــەتا کارەکــە تــەواو دەکــەن. بەشــێوەیەک کــە ســەرت لێیدەســوڕمێ، کارمەنــدەکان لەوانەیــە گلــەیی بکــەن، لەبــەر ئــەوەی کــاری زۆریــان پێدەکرێت، بەڵام کاتێك فشاریان دەخەیتەسەر دەڵێن ئێمە لە کارەکە وەڕەس نەبووین، بەڵکوو سەرقاڵین.

کــاری زۆر بکــە بــە کارمەنــدا نوێیــەکان، هــەر لــە ڕۆژی یەکەمــەوە بەشێوەیەکیان لــێ بکــە بێجگــە لــە کارەکــەیان شتی دیکەیان بە مێشکدا نەیەت. کــاری زیاتریــان پــێ بدە

لەوەی کە دەتوانن بەڕێوەی ببەن و کاری نوێ زیاد بکە بۆ سەر لیستی لێپرسراویەتییەکەیان. کاتێ بەوە دەست پێدەکەیت لەگەڵ کارمەندەکانتدا کە ئەرك و لێپرسراوێتیی زیاتریان بۆ بخەیتە سەر لیستەکەیان و ناوەناوە پێیان بڵێیت کە تۆ باوەڕت بە تواناکانی ئەوانە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی پێتداون، ئەوانیش دەکەونە کێبڕکێوە و دەبن بە باشترین کارمەندەکانت هەر لە یەکەم ڕۆژیانەوە.

دوای ئەوەی کێبڕکێت خستە ناو کارەکەیانەوە، وا لە کارەکە بکە سەرنجڕاکێش بێت و حەز بکەن کارەکە بکەن. هیچ شتێك هێندەی ئەوە کارمەند دڵخۆش ناکات کارێکی بدەنێ کە حەزی لێبێت و بەلایەوە سەرنجڕاکێش بێت، دەست بە کارەکە دەکەن کە پڕە لە جۆش و خرۆش و کرانەوە بە ڕووی ئەزموون و بیرۆکەی نوێدا.

## به‌شداریان پێ بکه‌ له‌ ڕاهێنانی به‌ڕێوه‌به‌رییه‌تیدا

وه‌ك چۆن كار زیاد پێدان گرنگه‌، به‌هه‌مان شێوه‌ ده‌بێت ڕاهێنان و پشتگیری كارمه‌نده‌ نوێیه‌كان بكه‌یت هه‌ر له‌ یه‌كه‌م ڕۆژیانه‌وه‌. كارمه‌نده‌ نوێیه‌كان شتێكیان هه‌یه‌ كه‌ پێی ده‌وترێت " ئه‌زموون كه‌می له‌ ئه‌ركدا". ئه‌مه‌ به‌ مانای ئه‌وه‌ دێت بێ گوێدانه‌ ئه‌و ئه‌زموونه‌ی كه‌ كارمه‌ند له‌ كاره‌كه‌ی پێشویدا هه‌یه‌تی، پێوه‌ری ئه‌زموونه‌كه‌ی بۆ ئه‌خرێته‌وه‌ سه‌ر سفر بۆ كاره‌ تازه‌كه‌ی، له‌ سه‌ره‌تاوه‌ ڕاده‌هێندرێته‌وه‌ وه‌كوو ئه‌وه‌ی كارمه‌نده‌ نوێیه‌كه‌ هیچ شتێك نه‌زانێت ده‌رباره‌ی كار و چۆنیه‌تی كردنی كاره‌كه‌.

له‌به‌ر ئه‌مه‌، واباشتره‌ كه‌ كارمه‌نده‌ تازه‌كه‌ له‌ژێر ده‌ستی خۆتدا كاربكات و ڕێنمایی بده‌یتێ له‌ هه‌نگاو به‌ هانگاوی كاره‌كه‌یدا و ئاراسته‌ی بكه‌یت له‌ هه‌موو به‌شه‌كانی كاره‌كه‌یدا. بیرۆكه‌ی " نوقم به‌ یان مه‌له‌ بكه‌" كه‌ خراوه‌ته‌ ملی مێژووی كتێبه‌كانی بواری بازرگانی،

ڕێگەیەکی شیاو و ئاقڵانە نییە لەگەڵ کارمەندێکی نوێدا بەکاری بهێنیت، ئەگەرچی لە پێشووتردا بەکار هێنرابێت.

ئەگەر خۆت کاتت نییە، کارمەندە نوێیەکانت لای کەسێکی دی ناونوس بکە کە ببێت بە لێپراوسراویان بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی بەو شێوەیە ڕێنمایی دەکرێن کە کۆمپانیاکە دەیەوێت، بەتایبەتی بۆ ئەوەی دڵنیابێتەوە لەوەی کارمەندەکان دەزانن کارەکە چییە و چۆن ئەنجام دەدرێت. ئەم "سیستمی هاوڕێی"یەتییە باشترین ڕێگایە بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کارمەندەکان بە هەستی باوەڕ بەخۆبوون و لێپرسراویەتییەوە دەست پێ دەکەن.

## بناغەیەکی پتەو دابنێ

کاتێک کارمەندەکان بەهێواشی دەست دەکەن بە کارەکانیان، هەر زوو بڕوا بە خۆیان دەهێنن کە ئەم جۆرە لە کارکردن لە لایەن کۆمپانیاکەوە قبوڵکراوە. دوای ئەوە قورس دەبێت بۆت گەر بتەوێت هانیان بدەیت بۆ ئەوەی ئاستی ئەداکردنیان باشتر بێت. چۆن دەست پێ بکات ئاواش بەردەوام دەبێت و کۆتایی دێت، شتێکی

چـاوەڕوانکراو دەبێــت ئەگــەر کارمەندەکــە لــە ساڵانی داهاتووشدا هەر ئاوا سست و هێواش بێت.

لەبیرت بێت، دووم پیتی لە هاوکێشەی سواندا لە بەشی دووەمــدا "work hard" بەچـڕوپڕی کــارکردن بــوو. هەمووشــتێك بکــە بــۆ دڵنیابوونــەوە لــەوەی کارمەندەکــە بەچڕوپڕی کار دەکات لەو ڕۆژەی کارەکەی دەدرێــتێ هــەتا ئــەو ڕۆژەی واز لـــە کارەکــە دەهێنێــت، بــەم جــۆرە کارمەندێکی وا دروست دەکەیت کە گوێڕایــەڵی دەبێـت بـۆ هاندانەکانت لە پێناوە بەرزبوونەوەی ئاستی لە داهاتوودا.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١.کاتێــك چــاوپێك کــەوتن لەگــەڵ کارمەنــدێکی چـاوەڕوانکراودا دەکــەیت، چـاوەڕێ بکــە هــەتا ئـارەزووی خـۆی بـۆ کــارکردن لات دەردەبڕێـت، هــەرگیز ماسـتاو بـۆ کەسێك مەکــە یــان زۆری لــێ مەکــە، بـۆ ئــەوەی کــارت بـۆ بکات.

٢.لە ئێستاوە هەر کاتێك کارێکـت دا بـە کەسێك دڵنیا ببــەرەوە لـــەوەی هـــەر لـــە یەکـــەم ڕۆژەوە کـــار و

لێپرسراوییەتییان بدەیتێ بۆ ئەوەی هەر لەو ڕۆژەدا بە ئەنجامی بگەیەنن، وە هەروەها دڵنیا ببەرەوە لەوەی کەسانی تر بهێنیتە ژێر دەستی خۆت و ڕاهێنانیان پێ بکەیت ببن بە کارمەندێکی ماندوونەناسی بەنرخی دامەزراوی تیمەکەت. گەر وەکوو بەڕێوەبەرێك کاتت نییە ڕاهێنانیان پێ بکەیت، ئەوا لە شوێنی خۆت کەسێکی تر ڕابسپێرە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان.

# بەشی چوار
# پێشبینییەکانت بەڕوونی بکەیەنە

کلیکی هاندان ئەوەیە وا لە کەسانی تر بکەیت هەست بە گەورەیی خۆیان بکەن. ڕێگەیەکیش بۆئەوەی هەست بە گەورەیی خۆیان بکەن، ئەوەیە بەشێوەیەکیان لێ بکەیت خۆیان بە براوە بزانن. هەموو کەسێك دەیەوێت چێژ لە هەستی بردنەوە ببینێت. ئەوان دەیانەوێت لە لایەن کەسانی دیکەوە هەست بە بەتوانایی و سەرکەوتووی و بەڕێزییان بکرێت.

چۆن کەسانی دی لە پێشبڕکێدا براوە دەبن؟ وەڵامەکەی زۆر سادەیە: یەکەم کەس دەگەنە خاڵی کۆتایی.

لە جیهانی کاردا چۆن کەسێك سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت؟ وەڵامەکەی: ئەرك و لێپرسراویەتییەکی دیاریکراو بەئەنجام دەگەیەنن. یەکێ لە یاساکانی کار بریتییە لەوەی بەئەنجام گەیاندنی کارێك سەرچاوەی وزە، جۆش و خرۆشی و ڕێزێکی خودی ئەرێنییە.

لە ڕاپرسییەکدا لە کارمەندەکانیان پرسی کە وەسفی باشترین کاریان بۆ بکەن کە تا ئێستا هەیانبووە، یەکێک لە وەڵامە هەرە باوەکان بریتی بوو لە" بەردەوام دەمزانی چاوەڕێی چیم لێ دەکرێت "

وە کاتێکیش داوام لێکردن وەسفی خراپترین کاریانم بۆ بکەن دەیانگووت " بەڕاستی من نەمدەزانی بەڕێوەبەرەکەم چاوەڕێی چیم لێ دەکات هەتا ئەنجامی بدەم ".

هەرکاتێك چاوەڕوانییەکانت بەڕوونی بگەیەنیت، ئەوا بوار دەدەیت بە کەسانی دی بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەرکێکی ڕوونی دیاریکراو و هەست بکەن کە براوەن، وە هەرکاتێکیش چاوەڕوانییەکانت لە کەسی بەرامبەر بە نادیاری و ئاڵۆزی بگەیەنیت یان هەر هیچ شتێکیان لێ چاوەڕوان نەکەیت، ئەوا تۆ ستافەکەی خۆت لە ئەزموونکردنی بردنەوە دادەماڵی.

## پێنج پاڵنەر بۆ بردنەوە

بۆ گەیشتن بە خاڵی کۆتایی و هەستکردن بە براوەیی، کەسەکە پێویستی بە شەش شت دەبێت.

١. ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرا کە گفتوگۆی لەبارەوە کرابێت و لەسەری ڕێك کەوتبن.

٢. هەبوونی پێوانە و ستانداردێك، بۆ ئەوەی کارمەندەکە بزانێت سەرکەوتن دەپێورێت.

٣. هەبوونی دوامۆڵەتێکی ڕوون و دیاریکراو، بۆ ئەوەی کارمەندەکە بزانێت کارەکە دەبێت کەی تەواو ببێت.

٤. ئەزموونی سەرکەوتن، مانای ئەوەیە کە پێویستە کارمەندەکان کارەکە لەکاتی خۆیدا، بەپێی بودجەی دیاریکراو و بەو ستاندارد و کوالێتییە بکات، کە پەسەندکراوە.

٥. پێزانین و خەڵاتکردن، پێویستە کارمەند دوای بەئەنجامگەیاندنی کارەکەی خەڵات و پێزانین وەربگرێت لە لایەن بەڕێوەبەرەکەیەوە، ڕێك وەکوو ئەو هاندەرانەی چەپڵە لێدەدەن و هوتاف دەکێشن بۆ وەرزشوانەکان.

هەرکاتێك گونجا، بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پێویستە دیاری بدرێت بە ئەنجامگەیەنەری کارەکە.

لەوانەیە ئەم وتەیەت بەرگوێ کەوتبێ " ناتوانی ئامانجێك بپێکیت، گەر ئامانجەکەت لێ دیار نەبێت". بۆ ئەوەی کارمەندەکانت هەست بە براوەیی بکەن، دەبێت ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرایان لەپێش بێت. هەتا ئامانجەکان ڕوونتر بن، ئاسانتر کارمەندەکان ئامانجەکەیان دەپێکن. هەتا ئامانجی زیاتریش بپێکن، زیاتر هەست بە براوەیی خۆیان دەکەن، وە هەتا زیاتر هەست بە براوەیی خۆیان بکەن، ڕێزی خودی و دڵخۆشییان بۆ کارەکە زیاد دەکات.

زۆربەی بەڕێوەبەرەکان، بەخۆشمەوە، هەڵەیەکمان کردووە، هەڵەکەش ئەوەیە لەبەر نەبوونی کاتی پێویست، بێ گفتوگۆکردن لەسەر کارەکە، کارەکەمان داوە بە کەسێك و دڵنیانەبوینەتەوە لەسەر ئەوەی ئایا کە کارەکەی پێدراوە بەتەواوی دەزانێ چی لێ چاوەڕوان دەکرێت بیکات. دوای ئەوەی کارەکە بەجوانی نەکرابوو یان بەشێوەیەکەی جیاوازکرابوو لەوەی دەتویست یاخود

بەجوانی و لەکاتی دیاریکراودا پێیان نەڵێت، ئەوا تۆ بووبیتە هۆی دامالینی ستافەکەت لە چێژبردن لە کارەکەیان. کاتێک دیار نییە چی دەبێت بکرێت و کەی دەبێت بکرێت، وە ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆکاری بەفیڕۆدانی کات لە کاتی کارکردن و بەگشتی کارەکە خۆیدا.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. بۆ جاری داهاتوو کارێکت دا بە کەسێك، چەند خولەکێك گفتوگۆی لەگەڵ بکە لەسەر چی دەبێ بکرێت، چۆن کارەکە دەپێورێت و کەی دوامۆڵەت دەبێت، وە هەروەها دڵنیابەرەوە کارمەندەکە دەگونجێت لەگەڵ ئامانجی کارەکەدا.

٢. دوای ئەوەی قسەتان لەسەر کارەکە کرد و ڕێك کەوتن لەسەری، بە کارمەندەکە بڵێ ئەو بابەتانەی گفتوگۆتان لەسەرکرد با بە تێگەیشتنی خۆی دووبارەی بکاتەوە بۆت، بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی ئەوەی تۆ وتوتە ئەوەی کارمەندەکە گوێی لێبووە هەمان شتن. لەوانەیە

هەر لە یەکەم جاردا سەرت بسوڕمێ لەو لێکتێنەگەیشتنەی
کە دروست دەبێت تەنانەت لە سادەترین کاردا.

# بەشی پێنجەم
# بەڕێوەبەریەتییەکی بەشداریخواز بەکار بهێنە

بەڕێوەبەریەتیی بەشداریخواز پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ بنیاتنانی هەستی خاوەنداریێتی، لێبڕان، دڵسۆزی و پەیوەندی بۆ کارەکە. لێبڕانی کارمەندەکان بۆ بە کوالێتیکردنی کارەکەیان پەیوەندییەکی ڕاستەوانەی هەیە لەگەڵ دانایی و ڕێکخستنی ئامانج و پێوەرەکانیان.

سوکرات گوتویەتی " ئێمە تەنها کاتێك دەتوانین شتێك فێر ببین کە گفتوگۆی لەبارەوە بکەین". پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هاوسەنگ هەیە لە نێوان گفتوگۆکردن و هانداندا. ئەگەر دەتەوێت کارمەندەکانت هانبدرێن بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارێکی ناوازە و چێژ لە ئاست بەرزی ڕێزی خودی و دڵنیایی خودی وەربگرن، ئەوا پێویستیان بە دەرفەتێکە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەیاندا لە کاتی دیاریکراودا لەسەر چۆنیەتی بەئەنجامگەیاندنی کارەکەیان.

بۆ ئەوەی بەڕێوەبەریەتیی بەشداریخواز ناوازەییی خۆی دەربخات، پێویستە لە لایەنی بەڕێوەبردنەوە لێبڕانێکی ڕاستەقینە هەبێت بۆ ئەم پرۆسەیە. پێویستە باوەڕت هەبێت بەوەی ئەو کەسەی کارێك ئەنجام دەدات پێویستە پەیوەندی بە کارەکەوە هەبێت. دەبێت بەشێوازێك ڕەفتارب کەیت کە کارمەندەکان هەست بکەن کە بەشدارن لە بڕیاردان لەسەر دیاریکردنی کارەکەیان و ئەو ستانداردگەلەشی بۆ کارەکەیان دادەنرێت و چۆنیەتی بەئەنجامگەیاندنی ئەو کارەی دەبێت بیکەن.

## دوو پێشبینیکەری ئەداکردن لە ئاستێکی بەرزدا

دەروونزانەکان دوو پێشبینیکەری گرنگیان دۆزیوەتەوە لە ژیانی هەرزەکاریدا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، ئەوانیش بریتین لە پێشبینیکردنێکی ئەرێنیانە لە لایەن خێزانەکەیەوە و ژینگەی دیموکراسی ناو خێزانەکە.

وەك چۆن خۆمان دەڵێین هەرزەکارەکان منداڵی دوێنێن بەس بەهانەی باشتریان پێیە، لەبەرە ئەوە ئەو دوو پێشبینیکەرەی کە پێشبینی گەنجانێکی ئاستبەرز

دەکـــەن؛ پێشـــبینیەکی ئەرێنیانـــە و ژینگەیـــەکی دیموکراسییانە، هەمان ئەو دوو پێشبینییەن کە دیاریکەری ئاستی ئەداکردنی کارمەندەکانن لە ژینگەی کارکردندا.

کاریگـــەرترین تیمـــەکانی کـــارکردن ئەوانـــەن کـــە دیموکراسـین، کـە بەڕێوەبـەر و کارمەنـد بەیەکـەوە وەك تیمێـك کـار دەکـەن، هـەموو کـەس بەشـداری و گفتوگـۆ دەکەن تیایدا لەبارەی ئەوەی پێویستە چی بکرێت.

هەتا کۆبونەوەی زیاترت هـەبێت لەگـەڵ کارمەندەکانی سـتافەکەت، هەسـتی بەشـداریکردنیان گـەورەتر و ڕێـزی خودیـان زیـاتر دەبێـت. باشـترین شـتیش کـە لێکچـوونی لەگەڵـدا بکـەیت بـۆی، خێزانـە. پەیوەندییـەکی ناوەنـاوە لەگەڵ خێزانەکەتدا بەمانای ئـەوە دێـت لەسـەر یـەك مێـزی نانخواردن کۆ ببنەوە و یاری و قسە بکەن لەگـەڵ یـەکتری. ئەگـەر ناوەنـاوە کـات تـەرخان نەکـەیت بـۆ خێزانەکـەت و کاتێـك لـە لات نـین پەیوەنـدییان لەگەڵدا بپچڕێنیت، ئـەوا ژیانی خێزانیت بەرەو داڕمان دەڕوات. بەهـەمان شێوەیشـە بۆ ژیانی پیشەیت.

## پێنج کلیل بۆ بنیادنانی تیم

لێرەدا پێنج توخمی سەرەکیمان هەیە بۆ بنیادنانی تیمێکی ئاستبەرز.

١. ئامانجگەلێکی هاوبەش: ئەندامانی تیمەکە لەکاتی دیاریکراودا یەك دەبینن بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئامانجەکانی تیمەکە، چی پێویستە بکرێت، کەی بکرێت و بە چ ستاندارد و کوالێتییەك بکرێت.

٢. بەهاگەلێکی هاوبەش و بنەماگەلێکی ڕابەرایەتیکردن: ئەندامانی تیمەکە گفتوگۆ دەکەن و ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی چۆن کاربکەن بەیەکەوە و ئەو بەها هاوبەشانە چین کە دەبێت تیایاندا بەردەست بێت، وەك، ئامادەبوون لە شوێنی کار لەکاتی خۆیدا ، قبوولکردنی لێپرسراوییەتی، یارمەتیدان، هاریکاریکردنی یەکدی و بردنەسەری ئەو بەڵێنانەی بە یەکدییان داوە.

٣. نەخشەگەلێکی هاوبەش بۆ کارکردن: هەموو ئەندامەکان دەزانن هەر ئەندامێکی تیمەکە چی لێ چاوەڕوان دەکرێت و یارمەتیان بدەن لەپێناو بەدەستهێنانی ئەنجامی گەورەتر و هەموو ئەندامانی

تیمەکە لێبڕاوانە کار دەکەن بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەو بەشە کارەی پێیان سپێردراوە لەکاتی خۆیدا و بەگوێرەی ئەو ستانداردانەی داواکراوە.

٤. ڕابەری کار: ڕابەری کار یاخود بەڕێوەبەر، کاری خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە دڵنیابێت لەوەی کارمەندەکان هەموو شتێکی پێویستیان بۆ کردنی کارەکەیان بەشێوەیەکی باش و تەواو لەبەردەستە، کاری بەڕێوەبەر لابردنی ئەو پاڵنەرانەیە کە بووە بە بەربەست لەبەردەم ئەندامانی تیمەکەدا تاکو نەتوانن لەکاتی دیاریکراودا کارەکە بگەیەننە ئەنجام.

٥. پێداچوونەوە و ڕاوبۆچوون وەرگرتنێکی ڕێکوپێك: ئەندامانی تیمەکە لە کاتێکی دیاریکراودا کۆ دەبنەوە و پرسیار لە خۆیان دەکەن و دەڵێن، " کارەکان چۆن دەڕۆن بەڕێوە؟". لێرەدا پەیوەندییەکی ئەرێنی و گفتوگۆیەکی کراوە هەیە، کە تەرکیزی لەسەر باشترکردنی تواناکانی تیمەکەیە بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی زۆرتر و باشتر.

لە بەڕێوەبەرایەتی بەشداریخوازدا بەڕێوەبەر وەک ڕاهێنەر و هاویەشێکی کار خزمەت دەکات. ئیشی بەڕێوەبەر ئەوەیە بپرسێ لە کارمەندەکانی چۆن کارەکەیان دەڕوات بەڕێوە و ڕێنماییان بداتێ و هانیان بدات. لە کۆبونەوەکانی بەڕێوەبەرایەتی بەشداریخوازدا، ئەو ئەرکانەی کە دەبێت جێبەجێبکرێت بەڕێوەبەر بەسەر کارمەندەکاندا دابەشی دەکات و گفتوگۆ دەکرێت لەسەر بەرەوپێشچوونی کارەکە، وە دڵنیای دەکاتەوە کە هەموو کارمەندەکان بزانن هەر کارمەندێک بە چ کارێک هەڵ دەستێت. هەموو بابەتێک لە لایەن ستافەکەوە تاوتوێ دەکرێت.

کارمەندەکان تەنها کاتێک حەز لە کارەکەیان دەکان کە بتوانن هاوکاری خۆیان پێشکەش بکەن بە خستنەڕووی بیرۆکە و ڕاوبۆچونەکانیان بە شێوازێکی ڕێکوپێک. هەتا بواری گفتوگۆکردن لەبارەی کارەکە خۆی، چی پێویستە بکرێت و باشترین ڕێگا بۆ کردنی کارەکە زیاتر بێت، ئاستی خۆتەرخانکردن و دڵسۆزی و تاسەمەندی بۆ کارەکە زیاتر دەبێت.

## بەردەوام زانیاری بدە بە کارمەندەکان

لە ڕاپرسییەکانی "GreatPlacetoWork.com"دا، کە ساڵانە نوێدەکرێتەوە، یەکێك لە بەهێزترینی ناو پاڵنەرەکان، هەستکردن بە "زانین"ە. کارمەندە دڵخۆشەکان لە لێدوانێکیاندا دەڵێن هەردەم وا هەستیان دەکرد، کە زانیاریی تەواویان دراوەتێ لەبارەی کارەکەیان و هەر شتێك لە دەوروبەریان ڕوو دەدات. وە هەستیان دەکرد کە ئەمان ئەندامێکی ڕێزلێگیراوی قەوارەیەکی گەورەتر بوون، کە بەشدارن لە بەدەستخستنی ئامانجەکانی کۆمپانیاکە.

ڕێگایەك کە ڕاوێژکارانی بەڕێوەبەرێتی بەکاری دەهێنن پێوانی ژینگەی کۆمپانیا یان بەشێکی کۆمپانیاکە، ڕێگاکە تێبینیکردنی ئەو جێناوانەیە کە کارمەندەکانی بەکاری دەهێنن بۆ وەسفکردنی خۆیان و کارەکەیان و دەزگاکەیان.

لە باشترین دەزگاکاندا وشەی "من یان هی من" دەبیستیت کاتێك وەسفی کارەکەیان دەکەن، و جێناوی "ئێمە یان هی ئێمە" دەبیستیت لە وەسفکردنی

بازرگانییەکەیاندا. لەو دەزگایانەشی زۆر باشنین وشەی "ئەوان یان هی ئەوان و کۆمپانیاکە" دەبیستیت کاتێك باسی کۆمپانیاکە دەکەن، بەشێوەیەك ناوی کۆمپانیاکە دەبەن وەك ئەوەی کۆمپانیاکە بەشێکی جوودا بێت لە کارمەندەکان.

یەکێك لە پاڵنەرە گرنگەکان کە لە کەسانی سەرکەوتوودا بەدی دەکرێت هەستی " خاوەندارێتی"یە. لە سەرەتادا کۆمپانیا و بەڕێوەبەرەکە لێپرسراویەتی و خاوەندارێتی ڕێکخستنی ئامانجەکان و بەئەنجامگەیاندنی ئەرکەکانیان لە ئەستۆدایە. کارمەندەکانی تەنها بەشدار دەبن لە یارمەتیدانت، بەڕێوەبەر کارەکە بەئەنجام دەگەیەنێت.

## هەستی خاوەندارێتی دابکوتە

هەتا زیاتر گفتوگۆ لەگەڵ کارمەندەکانت بکەیت لەسەر ئەو کارەی پێویستە بکرێت و باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی بیکەیت، وا لە کارمەندەکان دەکەیت زیاتر هەست بە خاوەندارێتیی کارەکە بکەن و وەکوو شتێکی تایبەتی

ژیانی خۆیان لە کارەکەیان بڕوانن. هەر کاتێک ئەم "گواستنەوەی خاوەندارێتی"یە جێگەی خۆی کردەوە لە کۆمپانیاکەدا، زیاتر هاندراو و سوور دەبن لە کردنی کارەکە بەجوانی و لەکاتی خۆیدا، لەبەر ئەوەی کارەکەیان وەك شتێکی سروشتی خۆیان دەزانن، وا هەست دەکەن ئەمان خاوەن کارەکەن و موڵکی ئەمانە، وەکوو وێنەدانەوەیەکی توانا کەسێتییەکانی خۆیان لە سەرکەوتنی کارەکە دەڕوانن.

کاتێك کارمەندەکان کارێك بەئەنجام دەگەیەنن کە هی ئەوانە، زیاتر هەست بە دڵخۆشی دەکەن لە ناوەوەی خۆیاندا. خۆیان وەکوو براوەیەك دێتە پێش چاو. ڕێزی خودیان زیاد دەکات و تەنانەت سووتر دەبن لەسەر وەرگرتنی کار و لێپرسراویەتییەکی دیکە، بۆ ئەوەی بتوانن هەستێکی ئەرێنی لەم کارەوە بۆ خۆیان بەدەست بهێنن.

هەبوونی هەستی خاوەندارێتی لە هەر کەسێدا کە کارت بۆ دەکات، بنچینەی بنیادنانی شوێنکارێکی ئاستبەرزە.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ بە زیندوو هێشتنەوەی کارمەندەکان، ئەمەیش بە هاوبەشیکردن و هاندانی تاك بە تاکی کارمەندەکان دێن بۆ یارمەتیدانت لە دیاریکردنی باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان.

٢. هەموو ڕێگایەك تاقی بکەرەوە کە وا لە کارمەندەکەت بکات کارەکە وەکوو شتێکی تایبەتی ژیانی خۆی وەربگرێت، دەکرێت ئەم ئامانجە بە پرسیارکردن لێیان و هاندانیان و گوێ لێ گرتیان لە کاتێکدا کە قسە دەکەن بەدەست بێت. هەتا زیاتر بواری گفتوگۆکردنیان لەسەر کارەکەدا لەگەڵتدا هەبێت، زیاتر خۆیان تەرخان دەکەن لەپێناو ئەوەی کارەکەیان بە جوانترین شێوە ئەنجام بدەن.

# بەشی شەشەم
# چوار پاڵنەری هاندان

ئەو چوار پاڵنەرەی لێرەدا باسی دەکەین، لەگەڵ ئەو سێ "R"ەی کە لە بەشەکەی تردا باسی دەکەین، لە هەموو دەزگایەکدا بوونی هەیە و دیاریکەری ئاستی هاندانی ستافە بە ئەرێنی یاخود نەرێنی. بەخۆشحاڵییەوە هەر دانەیەك لەم پێکهێنەرانە بە ڕێگایەکی ئەرێنی دەتوانرێت بگۆڕدرێت، زۆربەی جاریش ئەم گۆڕانە کاتێك ڕوودەدات کە بەڕێوەبەرێکی نوێ جێگەی بەڕێوەبەرەکەی پێشوو دەگرێتەوە کە شێوازی بەڕێوەبردنەکەیان سەرکەوتوو نەبووە لەوەی هەر کەس لە باشترین ئاستیدا بێت.

## بنچینەکانی هاندان

با لە چوار پاڵنەرەکەوە دەستپێبکەین کە بناغەی هاندانی هەر کەسێکە لە هەر دەزگایەکدا. چوار پاڵنەرەکەش ئەمانەن:

١) شێوازی ڕابەرایەتیکردن

٢) سیستەمی خەڵاتکردن

٣) ژینگەی دەزگاکە

٤) پێکهاتەی کار.

## شێوازی ڕابەرایەتیکردن

ئەم پاڵنەرە، بە پاڵنەری سەرەکی دادەنرێت لە دیاریکردنی ڕووانینی کارمەندەکان بەرانبەر کۆمپانیاکە و تا چەند هاندراون. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گۆڕینی ڕابەری کۆمپانیاکە ژینگەی دەروونی کۆمپانیاکە و ئاستی ئەداکردنی کارمەندەکانی بە گشتی دەگۆڕێت.

شـــێوازێك ڕابەرایـــەتیی شـــیاو ئەوەیـــە كـــە پشـــت دەبەستێت بە ئامانجەكانی كۆمپانیاكە، كارمەندەكانی نێو كۆمپانیاكە و ژینگەی دەرەوەی كۆمپانیاكە.

لـە تیمـی "SWAT" یـاخود تیمـی ئاگركوژێنـەوەدا، سـتایلێكی كـە شـیاو بێـت بـۆ ئـەو تیمانـە، سـتایلێكی ڕاستەوخۆ و دیكتاتۆرییـە، كـە كەسـی لێپرسـراوی تیمەكـە دەبێت تیایدابێت، بـۆ ئـەوەی بـە كارمەنـدەكانی بڵێـت كـە پێویسـتە چ شـتێك بـەخێرایی ئـەنجام بـدەن بـەبێ ئـەوەی هەستە كەسێتییەكانیان بەسەریاندا زاڵ ببێـت. ئـەم جـۆرە لە ستایل لە كۆمپانیا قۆنتەراتچییەكانیشدا بەدی دەكرێـت، كە زۆربەیان لە هەوڵی بێوچاندان بۆ مانـەوەیان لـە ژیانـدا، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەكاندا ئەم ستایلە قبووڵنـەكراوە لـە لایەن جیلـە نوێیەكـەی كارمەنـدان، كـە دەیانـەوێت قسـەی خۆیان هەبێت، گوێیان لێ بگیرێت و كاریگەریەریی دیاریـان هەبێت لەسەر چۆنیەتی كردنی كارەكەیان.

## مامەڵەی جیاواز لەگەڵ کەسانی جیاواز

دووەم ستایلی ڕابەرایەتیکردن، ستایلێکی هاوڕێیانەیە، لەم کاتەدا کەسێك لێپرسراوی بەشێکە، لە هەمان کاتدا وەکوو کارمەندەکانی بە هەمان ئاست و زانیاری و کارەمەیی کار دەکات. لەم جۆرە دەزگایانەدا، مرۆڤەکان ڕێزیان لێ دەگیرێت لەبەر ئەو زانیاری و کارامەیی و توانایەی هەیانە لە کارەکەدا.

ستایلە دیاریکراوەکانی تری ڕابەڕایەتیکردن بریتین لە "گوتن، فرۆشتن، قایلکردن و بەشداریکردن". شیاوی هەر دانەیەك لەم ستایلانە پشت دەبەستێت بە ئەزموونداری و بێ ئەزموونی کارمەندەکە، وە هەروەها هەبوونی کاتی پێویست یان نەبوونی کات. هەندێ جار وا دەخوازێت بەڕێوەبەر ستایلی جیاواز لە ڕابەرایەتیکردن بەکار بهێنێت بۆ کەسی جیاواز لە بارودۆخی جیاوازدا.

## سیستەمی خەڵاتکردن

هەموو دەزگاکان تایبەتمەندن بە شێوازێکی دیاریکراو لە سیستەمی خەڵاتکردندا ، کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە و لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی دیکە جیاوازە.

وەك مایکڵ لیبۆوف لە کتێبەکەیدا " مەزنترین بنەمای بەڕێوەبردن لە جیهاندا " دەڵێت: هەر شتێك خەڵات بکرێت، بە ئەنجام دەگات. ئەگەر دەتەوێت شتێك پەرە بسێنێت و زیاتر ببێت لە کۆمپانیاکەت، ئەوا خەڵاتی گەورەتر دابنێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، ئەگەر دەشتەوێت شتێك لە کۆمپانیاکەتدا کەم ببێت، ئەوا خەڵاتی کەمتر دابنێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە یان ڕێژەی سزادان و قبوڵنەکردنت بۆ کارەکە زیاد بکە. خەڵك بەپێی هاندەرەکان دەجوڵێنەوە.

شتێکی ئاساییە بۆ کۆمپانیاکان کاتێك زانییان کام بەرهەمیان قازانجی زیاتر لێ دەکەن، ڕێژەی خەڵاتکردن بۆ ئەو کەسە زیاد بکەن کە فرۆشیاری بەرهەمەکەیە، لە هەمان کاتیشدا کەمکرنەوەی خەڵات بۆ ئەو کارانەی کە کەمترە قازانج دەکەن. فرۆشیار و بەڕێوەبەرەکانیش

کاردانەوەیەکی خێرایان دەبێت بۆ کەمبونەوە و زۆربوونی خەڵات بۆ چالاکییەك و ئامانجێکی دیاریکراو.

## کەشی دەزگا

ئایا کۆمپانیاکەت شوێنێکی چاکە بۆ کارکردن؟ کەشی دەزگا لە لایەن بەڕێوەبەرەوە دروست دەکرێت و پارێزگاری لێ دەکرێت، و بریتییە لە مامەڵەی کارمەندەکان لەگەڵ یەکدی لە کاتی کارکردندا.

کاتێك تۆماس جەی واتسۆن بەردی بناغەی کۆمپانیای "IBM" ی دانا، لە هەمان کاتدا سێ بەهای کرۆکی بۆ کۆمپانیاکە دانا. بەهاکانیش بریتیبوون لە " بەرهەم و خزمەتێکی نایاب، خزمەتێکی نایابی کڕیار و ڕێزی تاك"

کە داهاتووی "IBM"یان دیاری دەکەن، لە کۆتاییدا توانی بیکات بە گەورەترین و ڕێزلێگیراوترین کۆمپانیای بواری کۆمپیتەر لە جیهاندا.

بنەمای " ڕێزگرتن لە تاك " بەخورتی کرایە ناو هەموو ئاستەکانی دەزگا نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکانیشەوە. لە "IBM" دا دەتوانی هەر هەڵەیەك هەبێ ئەنجامی بدەیت،

بەڵام هەرگیز ناتوانی ڕێز لە کەسێک نەگریت، یاخود بچوکی بکەیتەوە و بە بچوک تەماشای بکەیت، وە بە هیچ جۆرێکیش ناتوانی جوێنێک یان قسەیەکی ناشرین بە کەسێک بڵێیت لە دەرەوە و ناوەوەی کۆمپانیاکەدا. مامەڵەی خراپ لەگەڵ هاوپیشەکانتدا، بەتایبەتی ئەوانی لەژێر دەستتدا کار دەکەن، دەبێتە هۆی دەرکرانت لە کۆمپانیاکە، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە چەندێک خزمەتت بە کۆمپانیاکە کردووە.

بەهۆی ئەم کەشەوە کە لە دەزگای "IBM" دا هەبوو، خەڵک بە ئەوەوە نەدەوەستان پێشبڕکێ بکەن، بۆ ئەوەی کار لەوێ بەدەست بهێنن، بەڵکوو دوای ئەوەی دەگەیشتنە ئەوێ و کاریان دەکرد لەوێ، دەبوون بە دڵخۆشترین و بەرهەمدارترین و زانخوازترین کەس لە هەر کۆمپانیا و پیشەسازییەکدا.

## پێکهاتەی کار

هەندێک کار هەر لە سروشتیاندا پێویستیان بە ماندان، زانخوازی، ئەندێشەکردن و ئاستێکی بەرزە لە وزە. ئەو

کارانەی کە دەکەونە بواری پەیوەندیکردن و گفتوگۆکردن و بەریەککەوتن لەگەڵ کەسانی دیدا بۆ سوود وەرگرتن لە تواناکانیان، بۆ ئەوەی کارەکە خێراتر بەڕێوە بچێت، کاریگەلێکن کە زۆر وزەی تاکی ئەنجامدەری کارەکە بەکار دەهێنێت. جگە لەوەی کارەکە پڕ لە کێبڕکێ و جۆش و خرۆشییە، حەڵاتێکی باشیشی بۆ ئامادەکراوە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە، بڕێکی زۆری کاتەکانی کارکردن پێویستە کە پێوانە کراوە و کراوە بە شتێکی ڕۆتینی کە جۆش و خرۆشێکی وای نەهێڵاوە لە کارەکەدا، کاریگەری هەیە لەسەر زیندوویی و تێچووی کارەکە. کارێك قورس دەبێت گەر بتەوێت هانی ئەو کرێکارەنە بدەیت کە بە درێژایی ڕۆژ کار دەکەن و بۆ ئەوەی زۆرترین بەرهەمیان هەبێت بەردەوان چاودێرییەکی وردیان لەسەرە.

دەزگا باشەکان ئەوانەن کە هەوڵ دەدەن پێکهاتەی کارەکە بەشێوەیەك دابڕێژن کە لەگەڵ سروشتی کارمەندەکاندا بگونجێت و هەتا بۆیان بکرێت کارەکە چێژبەخش و خۆش دەکەن.

ڕابەر دەتوانێت جیاوازییەکی ڕاستەوخۆ دروست بکات پێکهاتـەی خـەڵاتکردن و کارەکـە، وە هـەروەها کەشـی دەزگاکـە دەتوانرێـت بگـۆڕێن، بـەڵام بەلەسـەرخۆیی، وە هەموو شتەکانیش دەبێـت بـەوریایی و وردییـەوە بـیری لـێ بکرێتـەوە. سـتایلی ڕابەرایـەتیکردنی دەزگایـەك پاڵنەرێکـە کـە زۆر بـەخێرایی دەتوانرێـت بگۆڕدرێـت، وە گۆڕانیشـیان دەتـوانێ گۆڕانکارییـەکی مـەزن بخوڵقێنێـت لـە ماوەیـەکی کەمدا.

چـیرۆکێك هەیـە باسـی کارگەیـەك دەکـات کـە بەڕێوەبـەرەکانی کەسـێکی سیاسـی بـوون و ئەوەنـدەی خەمی خـەڵات و مافـەکانی خۆیـان بووە، ئەوەنـدە ورەی کرێکارەکانیـان بـەلاوە گـرنگ نـەبووە. کارگەیـە بەتـەواوی کەوتە بەر هەژموونی بێ ورەییەوە و ئـازاری کـەمی ئاسـتی بەرهـەمهێنانی و زۆری ڕێـژەی هەڵـەکانی دەچەشـت، بـە زۆربـەی ئەگـەرەکان لـە لایـەن بەڕێوەبـەری گشـتییەوە دادەخرا.

بـەڵام لـەجیاتیی ئـەوەی کارگەکـە دابخـات، هەستا بـە دانانی بەڕێوەبەرێکی نوێ کە بەتـەواوی جێـی بەڕێوەبـەرە

نوێیەکەی گرتەوە. بەڕێوەبەرە نوێیەکە، لە یەکەم ڕۆژیدا چاوەڕێی گەیشتنی کرێکارانی شەفتی یەکەمی دەکرد، کە دەبوایە ئۆتۆمۆبێلەکانیان لە گەراجە قیرتاونەکراوەکە ڕابگرن و بەناو ڕێگا قوڕەکەدا بێن بۆ بەردەم دەرگای کارگەکە. کاتێک هەموو کرێکارەکان خڕبوونەوە، بەڕێوەبەرە نوێیەکە خۆی ناساند و لەپێشچاوی هەموو کرێکارەکاندا ڕۆیشت بۆ لای ئەو گەراجەی کە جێبەجێکاران و کەسە گرنگەکانی کارگەکە دەیانتوانی لەوێ ئۆتۆمۆبێلەکانیان ڕابگرن. یاریدەدەرەکەی سەتڵێک بۆیاخی دا بەدەستەوە و بەڕێوبەرە نوێکەش هەستا بە بۆیەکردنی ناوی جێبەجێکارەکان کە دەیانتوانی لەوێ ڕای بگرن و بە کرێکارەکانی گووت " هەرکەس زووتر بگاتە شوێنی کارەکەی، شوێنێکی باشتری دەست دەکەوێت بۆ پارککردنی ئۆتۆمبیلەکەی ".

لەماوەی شەش مانگدا کارگەکە گەشتە باشترین ئاستی لە هەموو مێژوویدا، وە بووە بەرهەمهێنەرترین و قازانجکەرترین کارگە لە لەناو گشت دەزگای نەتەوەییدا. یەك ڕابەری ئاستبەرزی هاندەر بە بینابییەکی ڕوون و

ئاره‌زووبه‌خشه‌وه بۆ ده‌زگاكه‌، ده‌توانێت ببێت به‌ هێزێكی هانده‌ر بۆ گۆڕان و گۆڕانكاریكردن له‌ كاتێكدا گه‌ر هیچ شتێكیش نه‌گۆڕدرابێت.

## ڕاهێنانی كرداره‌كی

١. به‌ كه‌شی ناو ده‌زگاكه‌تدا بچۆره‌وه‌ و بپرسه‌: ئایا به‌ها و ڕێزی تاكه‌كه‌سی به‌ڕێكوپێكی پشتگیری ده‌كرێت؟ په‌یوه‌ندیی ڕاسته‌وخۆت هه‌بێت له‌گه‌ڵ ئه‌ندامانی ستافه‌كه‌ت یان داوا له‌ به‌ڕێوه‌به‌ره‌كانت بكه‌ به‌ كارمه‌نده‌كانیان ڕابگه‌یه‌نن كه‌ هه‌وڵی بچوككردنه‌وه‌ و بێڕێزیكردن به‌رانبه‌ر به‌ كه‌سێك جێگه‌ی نابێته‌وه‌ له‌ناو كۆمپانیاكه‌دا.

٢. له‌گه‌ڵ كارمه‌نده‌كانی له‌سه‌ر كاره‌كه‌یان قسه‌ بكه‌، لێیان بپرسه‌، ئایا كاره‌كه‌یان به‌لاوه‌ خۆشه‌ و كێبڕكێی تێدایه‌. وه‌ داوای بیرۆكه‌ی خۆیانیان لێ بكه‌، بۆ ئه‌وه‌ی كاره‌كانیا له‌ ڕۆتینیات بكه‌نه‌ ده‌ره‌وه‌.

# بەشی حەوتەم
# سێ "R" ەکە

هەروەک چوار پاڵنەرەکەی هاندان کە لە بەشی پێشوتردا باسی لێوە کراوە، سێ "R"ەکەی هاندانیش لە هەموو دەزگا و بزنزێکدا بەدی دەکرێت و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر تاسەمەندی و لێبڕانی کارمەند هەیە. سێ "R"ی هاندانیش بریتین لە: خەڵاتکردن"Reward"، پێزانین"Recognition" و پشتگیریکردن"Reinforcement".

## خەڵاتکردن"Reward"

خەڵاتکردن وەکوو هاندانێکی سەرەکی مرۆڤ وایە، و پێویستە خەڵاتکردنەکە لەسەر بنەمای ئاستی ئەداکردنی کەسەکە بدرێت. بەتایبەتی دەبێت لەسەر بنەمای کارگەلێکی سەرکەوتوو کە دەبنە هۆی یارمەتیدانی و بەرەوپێشبردنی دەزگایەکە بدرێت، کە دەبنە مایەی ئەوەی دەزگاکە بگاتە ئەو ئامانجەی کە بۆ بەرهەمێنان و قازانجکردنی دیاریکردووە.

نابێت لەسەر بنەمای گەورەیی و پەروەردە و پەیوەندییە سیاسییەکان خەڵات بدرێت، بەڵکوو تەنها لەسەر بنەمای ئاستی ئەداکردن خەڵات دەدرێت.

تەنها ڕێگا بۆ ئەوەی خەڵاتکردن ببێتە هۆی یارمەتیدانی سەرکەوتنی کۆمپانیاکە لەکارەکانیدا، بریتییە لەوەی خەڵاتەکان ڕاستەوخۆ بەستراونەوە بە ئاستی ئەداکردنی تاکێك کە یارمەتی هەموو دەزگاکە دەدات.

ئەو دەزگایانەی کە خێرا گەشە دەکەن خەڵاتکردنەکانیان لەسەر بنەمای ئەداکردنە. لەم جۆرە کۆمپانیایانەدا تەنها یەك ڕێگە بۆ ئەوەی لەم دەزگایانەدا بەرەو پێشەوە بڕۆیت ئەنجامدانی کارێکی ناوازە، گونجانێکی تەواو لەگەڵ هاوپیشەکانتدا و یارمەتیدانی گەشەسەندنی بەردەوامی کۆمپانیاکەیە.

لە هەندێ دەزگادا، کلیلی سەرکەوتن بریتییە لە "چۆنیەتی کردنی یاری"یەکە. لەم جۆرە دەزگایانەدا پارە بۆ زیادکردن و پلە بەرزکردنەوە ، لەسەر بنەمای کاریگەری و کۆنترۆڵ لەسەر کەسانی دی بۆ سەرکەوتنەکانی خۆت دەدرێت. لەم جۆرە دەزگایانەدا

تەرکیز لەسەر ئاستی ئەداکردنی تاکەوە دەگۆڕێتە سەر چالاکییە سیاسییەکان.

## دوو جۆری خەڵاتکردن

دوو جۆر هەیە لە خەڵاتکردن، خەڵاتکردنی ڕاستەوخۆ و خەڵاتکردنی ناڕاستەوخۆ.

خەڵاتە ڕاستەوخۆکان وەکوو پارە، پشووی کار و شتەکانی دی کە بەرجەستە بن. باشترین ڕێگا بۆ بەکارهێنانی پارە وەکوو خەڵاتێك، دیاریکردنی بەشێکی دیاریکراو لە پارەیە لە بەرانبەر بەدەستهێنانی ئامانجێك یان هەستان بە ئەنجامدانی ئەرکێك. هەندێ کۆمپانیا دەکەونە هەڵەیەکەوە کە بڕە پارەیەکی دیاریکراو دەدەن بە کەسێك بۆ ئەداکردن و بەئەنجامگەیاندنی کارێك یان ئامانجێکی دیاریکراو، هەڵەکە لەوەدایە کە کۆمپانیاکە دەبێت ئەو پارەیە بدات بە کارمەندەکە بێ ئەوەی کارمەندەکە گرەنتی هەبێت جارێکی دیکە هەمان ئاست پێشکەش بکاتەوە. باشترین جۆری خەڵات، بڕێکی دیاریکراوە.

خەڵاتــە ناڕاســـتەوخۆكانیش وەكـــوو مەدالیایـــەكی سەركەوتن یان خەڵاتێك لە یادی ساڵانەی كۆمپانیاكـەدا بـۆ ئــەو كەســانە تــەرخان بكرێــت كــە ئاســتێكی ناوازەیــان پێشكەشكردووە. دەكـرێ خەڵاتەكـە وەكـوو درێـژەدان بـە پەروەردەكردنی كەسەكە بێت، كە بتوانێت لەو بوارەدا كـە كارمەندەكە و كۆمپانیاكەش هەردووك سوودی لـێ دەبیـنن درێـژە بـە پـەروەردەكردن و خوێنـدنی خـۆی بـدات، یـان دەكرێ پشوویەكی كـاتی بێـت بـۆ كارمەندەكـە بەمـەرجێك هیچ كاریگەرییـەكی نـەرێنی لەسـەر ئاسـتی بەرهـەمهێنان و ئاسـتی كۆمپانیاكـە نـەبێت و هـیچ زەرەرێكـی مـاددی بـەر كۆمپانیاكە نەكەوێت.

پیاهەڵـدان و ستایشـكردن بەتایبـەتی لــەناو ئـاپۆڕای كارمەندەكان و كەسانی دیدا، خەڵاتێكی دی ناڕاستەوخۆیە كـە دەبێتــە هـۆی بەرزبوونـەوەی ورەی كەسـەكە و زیـاتر هانی دەدات بەرەوپێشەوە بچێت بـۆ ماوەیـەكی زۆر. ئـەم جـۆرە خەڵاتــە، خــەڵاتێكی عاتفییــە كــە پارەیــەكی وای تێناچێت و قازانجێكی زۆر بەرهەم دەهێنێت.

## پێزانین "Recognition"

هەرکاتێك کارمەند کارێکی باشی ئەنجامدا، پێویستە لەسەر بەڕێوەبەر کە پێزان بێت بە کارەکەی. یەکێك لە هاندەرە هەرە گەورەکان لە ژیانی کارکردندا، پێزانینە لەبەر ئەنجامدانی کارێکی باش یان لەچاو کارمەندانی دیکەدا هەوڵی زیاتر درابێت. لە لایەکی ترەوە یەکێك لەو گلەییە گەورانی کە لە جیهاندا هەیە، فەرامۆشکردنی کارێکە لە لایەن بەڕێوەبەرەوە کە بکەری کارەکە زۆر خۆی لەگەڵ کارەکەدا ماندوو کردووە.

هەر کاتێك کەسێك شتێکی شازی ئەنجامدا یان تەنانەت هەوڵی دا ئەنجامی بدات، کە لە سەروو پێویستییەکانی کۆمپانیاکەشەوە بێت، ئەوا لەسەر بەڕێوەبەر پێویستە بەرانبەر کارەکە پێزان بێت بەتایبەت لەگەڵ کەسەکەدا و بەگشتیش. یاساکە بەم شێوەیە، ئەوەی پێی بزاندرێت، دووبارە دەکرێتەوە.

## پشتگیریکردن "Reinforcement"

پشتگیریکردن یەکێکە لە بەهێزترین تەکنیکەکانی هاندان. هەرشتێك ستایش، قبوڵ، پێزانین و پشتگیری بکەیت دووبارە دەبێتەوە، بگرە زۆریش دووبارە دەبێتەوە. هەر کاتێك پشتگیری لە ڕەفتاری کەسێك دەکەیت بە وتنی ئەوەی کە تۆ کارەکەی ئەوت بەلاوە گرنگە، هەست بە گەورەبوون و ناوازەبوونی خۆیان دەکەن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام لە گەڕاندا بن بەدوای هەلێکدا بۆ ئەوەی پشتگیریان بکەیت. هەرکاتێك لەبەرانبەر کاری باشدا پشتگیر و ستایشکار نەبوویت، ئەوا کارمەندەکانت کەسێکی تەمبەڵیان لێ دەردەچێت.

زۆربەی بەڕێوەبەرەکان باوەڕیان وایە کە دەتوانن بە پارە دەتوانی هەقی تەواوەتی کارێك بدەیت، بەڵام لە لای کەسێکی ئاسایی بەهەمان شێوە نییە. هەرکاتێك کارمەندەکان ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکاردەهێنن بۆ ئەنجامدانی کارێك بەجوانی، باوەڕیان وایە کە پێزانین و پشتگیریکردن تەنها خەڵاتە وەری دەگرن.

زۆرکردن لە کارمەندەکان بۆ دوو ئەوەندەی ئاستیان

یەکێك لە کۆمپانیا کڕیارەکانم خشتەیەکی ئاستی ئەداکردنیان دانابوو و لە چوار ئاست پێکهاتبوو، جگە لەوەی ڕێژەی مووچە و پلە بەرزکردنەوەی دیاری دەکرد، ڕێژەی بەخششەکانیشی لە کۆتاییی ساڵدا دیاری دەکرد. وەك لە پێشتردا پێشنیارم کردبوو، بەخشش باشترین جۆری خەڵاتە کە لە پارە پێکهاتبێت. چوار ئاستەکەی ئەداکردن لە کۆمپانیاکەدا بریتی بوون لە:" ئەدای ئاسایی، ئەدای نایاب، سەرسوڕمانی یەکەم و سەرسوڕمانی دووەم"

ئەدای " ئاسایی "، بەمانای ئەوە دێت کاری کارمەندەکە ئاساییە و کارەکە لە هەڕەشەدایە بۆ ساڵی داهاتوو. ئەدای " نایاب " کەمترین ڕێژەیە بۆ مانەوە و پلە بەرزبوونەو لە کارەکەدا.

کاتێك کارمەندەکان ئاستی ئەداکردنەکەیان لە ڕێژەی پێویست زیاتر بوو وە لە لایەن گشت کەسەوە بە کارێکی ناوازە ناوبرا، ئەوا گەشتونەتە ئاستی سێیەمی ئەداکردن کە پێی دەگوترێت "سەرسوڕمانی یەکەم".

بــــه‌رزترین ئاســـتی ئــــه‌داکردنیش پێــــی ده‌گوترێــت "سه‌رسوڕمانی دووه‌م". له‌به‌رئه‌وه‌ی ئه‌م كۆمپانیایه‌ كاری قۆنته‌راتچێتی ده‌كرد، هه‌لێكی باش هه‌بوو بۆ كه‌سه‌ پله‌ به‌رز و به‌ئه‌زموونه‌كان كه‌ جێده‌ستی خۆیان به‌جێبهێڵن له‌سه‌ر به‌شه‌ جیاوازه‌كانی خوار خۆیان. كاتێك كه‌ ئاستی ئه‌داكردنی كه‌سێك به‌شێوه‌یه‌ك ده‌بوو كه‌ هیچ كه‌سێك به‌ مێشـــكیدا نـــه‌ده‌هات بـــه‌و شـــێوه‌یه‌ بێـــت، ئـــه‌وا پلـــه‌ی "سه‌رسوڕمانی دووه‌م"ی وه‌رده‌گرت.

كارمه‌نـده‌ نایابـه‌كان ڕێـژه‌ی ١٠٪ بـۆ ٢٠٪ ی مووچـه‌ی ساڵانه‌یان وه‌كوو به‌خششێك وه‌رده‌گرت. كارمه‌ندگه‌لێكیش كه‌ پله‌ی سه‌رسـوڕمانی یه‌كـه‌میان به‌ده‌ستهێنابوو لـه‌ ٥٠٪ مووچـه‌كه‌یان وه‌كـوو به‌خشـش وه‌رده‌گـرت و لـه‌ ٥٠٪ بـۆ ١٠٠٪ ی به‌خشـــش، بـــۆ ئـــه‌و كارمه‌ندانـــه‌ بـــوو كـــه‌ پلـــه‌ی سه‌رسوڕمانی دووه‌میان وه‌رگرتووه‌.

لـه‌ ڕێگـه‌ی خـه‌ڵاتكردن و پێزانینـه‌وه‌ ئـه‌م كۆمپانیایـه‌ هـانی كارمه‌نـده‌كانی ده‌دا بـۆ پێشكه‌شـكردنی ئاسـتێكی بـه‌رز. بـه‌هۆی ئـه‌وه‌وه‌ دانـرا بـه‌ یـه‌كێك لـه‌ خێراتـرین شـاز.

کۆمپانیـــای گەشەســـەندو و قازانجکـــارترین لـــە بـــواری پیشەسازی خۆیدا.

ســـێ "R" یارمـــەتیت دەدات بـــۆ ناســـاندنی جـــۆری ئەداکردنەکـــەی نـــاو دەزگاکـــەت. ئـــەوەت بـــەبیر بێـــت کـــە دەزگاکان و بەڕێوەبەرەکان هەرچی خەڵات بکـەن زیاتریـان لەوە دەست دەکەوێت. بەمانای ئەوە دێ کـە تـۆ دەتـوانی بـــەخێرایی ڕێبـــەری و قـــاڵبی ڕەفتـــار و ئـــەداکردنی کۆمپانیاکـەت بکـەیت بـەو شـێوەیەی کـە خـۆت دەتـەوێت خەڵاتی بکەیت و پێبزانیت و پشتگیری بکەیت.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. بیر لە ڕێگاگەلێك بکەرەوە بۆ خەڵاتکردن و پێـزانین و پشتگیریکردنی ئەو ڕەفتـار و ئەداکردنـەی کـە خوازیـاری لـە کارمەندەکەتـدا هـەبێت. بـەدوای ڕێگایەکدا بگـەڕێ بـۆ ئـەوەی ئـەم کـارە لـە ڕۆژێکـدا چـەند جارێـك دووبـارە بکەیتەوە.

٢. لە ئەندامانی ستافەکەت بپرسە بە تـاك بێـت یـاخود بـە گـــرووپ، چ شـــتێکیان بـــەلاوە زۆر بەنرخـــە ئەگـــەر

لەبەرانبەر پێشکەشکردنی ئاستێکی باشیاندا پێیاندرا.

زۆرینەی جار ئەوەت پێدەڵێن کە تۆ پێویستتە بۆ

دروستکردنی باشترین بەرهەم لە هەر کارمەندێك.

# بەشی هەشتەم
# بەپێی بەهاکان بەڕێوەبەرایەتی دابنێ

هەموو کەسێك چی لە ناخیدا بێت ئەوە دەداتەوە. کرۆکبوونت و ئەو تەوەرەیەی کە هەموو ژیانت بەدەوریدا دەسوڕێتەوە پێکهاتووە لە قووڵترین ئەو شتانەی باوەڕت پێیەتی و بەبەهای دادەنێیت. ئەوە بەهاکانتە کەسایەتی و تایبەتمەندییەکانت دیاری دەکات، بەهاکان دیای دەکەن کە تۆ چیت و چی نیت. یەکێك لە نیشانەکانی کەسی گەورە ڕوونیەتی لەبارەی بەهاکانیەوە و هەردەم ڕەتی دەکەنەوە بەهاکانیان لەگەڵ بارودۆخەکاندا.

تەنها کاتێك بەڕاستی دڵخۆشی لە دەرەوەتدا کە بەهاکانت گونجاوین لەگەڵ ناختدا. تەنها لە کاتێکدا باشترین ئەدای خۆت پێشکەش دەکەیت کە ڕەفتارەکانت لەگەڵ ئەوەی کە باوەڕت هەیە بنەما بێت بگونجێت. لە لایەکی ترەوە، فشار و گرژیش کاتێك دەست پێ دەکات کە چالاکی و ڕەفتارگەلێك بکەیت لە دەرەوەدا کە لەگەڵ ئەوەی لە ناخی خۆتدا بەڕاستی باوەڕت پێیەتی

یه‌کنه‌گرێته‌وه و نه‌گونجێت. باشترین کۆمپانیاکان ئه‌وانه‌ن ئه‌و که‌سانه ده‌ناسنه‌وه که ناتوانرێت هانبدرێن، بۆ ئه‌وه‌ی کار بکه‌ن بکه‌ن بۆ ده‌زگایه‌ك که به‌هاکانیان له‌گه‌ڵ یه‌کدی ناگونجێت.

## پێکهاته‌ی که‌سایه‌تی

وا بێنـه پێشچـاوی خـۆت کـه که‌سـایه‌تیت لـه چـه‌ند بازنه‌یه‌ك پێکهات بێت، وه‌کوو ته‌خته‌ی یـاری تیرهاویشتن، کـه لـه بـه‌ها کرۆکییه‌کانتـه‌وه ده‌سـت پـێ ده‌کـات. وه به‌هاکانت بازنه‌ی دووه‌م دیـاری ده‌کـه‌ن، بـه مانایـه‌کی دی باوه‌ڕت دیاری ده‌که‌ن ده‌رباره‌ی خۆت و ده‌رباره‌ی ڕاستی بوونـت. تـۆ هه‌میشـه جیهـانی ده‌ره‌وه لـه ڕێـی شاشـه‌ی باوه‌ڕه‌کانته‌وه ده‌بینیت، ئه‌گه‌ر چی ڕاست بێت یـان هه‌ڵـه، سنووردار بێت یاخود بێسنوور.

با به جۆرێکی دیکه هه‌مان قسه بکه‌ین، تۆ جیهـان بـه‌و شێوه‌یه نابینیت که هه‌یه، بـه‌ڵکوو بـه‌و شـێوه‌یه ده‌بینیت که خۆت هـه‌یت. وه‌ك چـۆن جارێکیـان ویلیـام جـه‌یمس له

زانكۆی هارفارد وتی "باوەڕەكان ڕاستییەكان دروست دەكەن."

سێیەم ئاستی كەسایەتیت، سێیەم بازنەی كەسایەتیت، بریتییە لە پێشبینییەكانت. وەك چۆن بەهاكانت باوەڕت دیاری دەكەن، بەهەمان شێوە باوەڕیشت پێشبینییەكانت دیاری دەكات دەربارەی خۆت و كەسانی دی و جیهانی دەوروبەرت. پێشبینییەكانت دەبن بەو سروشتەی خۆت بەجێیان دەگەیەنیت. پێشبینییەكانت بۆ كەسانی بەرانبەرت كاریگەرییەكی ناڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ڕەفتاریان، بەتایبەتی پێشبینییەكانت بەرانبەر منداڵەكانت، هاوسەرەكەت و كارمەندەكانت. پێشبینییەكانت لەبارەی خۆت، بە ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی، دیاریكەری ڕەفتارەكانت و ئاستی ئەداكردنتە.

## هەڵوێستت بڕیار لەسەر كەسایەتیت دەدات

بەهاكانت و باوەڕەكانت و پێشبینییەكانت هەموو پێكەوە دیاریكەری هەڵوێستەكانت دەبن و دیاریكەری ئەو

باوەڕ و ئەوڕوانینانە دەبن کە هەتە بۆ ژیان. ئەگەر بەهاگەلێکی باشت هەبن، لەگەڵ باوەڕگەلێکی ئەرێنی و پێشبینیگەلێکی باوەڕپێکراو، ئەوا هەڵوێستێکی ئەرێنی و گەشبینانەت دەبێت بۆ خودی خۆت و جیهانی دەوروبەریشت.

پێنجەم بازنە، بازنەی ڕەفتارەکانە. ئەم ڕەفتارانەش لە لایەن بەهاکان، باوەڕەکان، پێشبینییەکان و هەڵوێستەکانتەوە دیاری دەکرێت.

## کردار هەموو شتێکە

ناخی مرۆڤ بە وتەکان، نیاز و هیواو ئاواتەکانی دەرناکەوێت. ئەوەی دەری دەخات تەنها کردارەکانیەتی، بەتایبەتی ئەو کردارانەی کە لەژێر فشاردا ئەنجامدراون، لە کاتێکدا کەسەکە بەزۆر دەبێت لەنێوان کردارگەلێك دژ بەیەکدا دانەیەکیان هەڵبژێرێت.

بۆچی گفتوگۆکردن لەسەر بەهاکان ئەوەندە گرنگە؟

لەبەرەوەی بەهاکانت بەشێکن لە بۆماوەیی تۆ.

لەبەرەوەی بەهاکان بەقووڵی لەناو نەستتدا

بەرنامەڕێژکراون. هەر ئەوانن دیاریکەری هەڵوێست و ڕەفتارەکانتن، وە هەندێ گۆڕانکاری لە ژیانتدا.

باشترین کۆمپانیا و بەڕێوەبەرەکان ئەوانەن کە کار بە بەهاکان دەکەن. زۆر ڕوون و ئاشکران دەربارەی بەهاکانی خۆیان و چۆنیەتی دەربڕینی ئەم بەهایانە بە کردار و ڕەفتار لە لایەن ئەو کەسانەی لەوێ کار دەکەن. لەکاتی کارپێداندا ئەوەندەی گرنگی بە توانا و کارامەیی دەدەن، بەهەمان شێوەش گرنگی بە کەسایەتی و بەهاکانیش دەدەن.

کاتێک کارمەندەکان بە دڵخۆشییەوە کارەکانیان دەکەن بۆ دەزگایەک، کە دەزگاکە ئەو بەهایانەی بەلاوە گرنگ بێت کە کارمەندەکان بەلایانەوە گرنگە. بەهاکان هەموو شتێکن.

یەکێك لە کۆمپانیای کڕیارەکەم، کە بە بیرۆکەیەک دەستیپێکرد بوو بە سەرکەوتنێکی نەتەوەیی، سەرەتای ژیانی پیشەیی بەوە دەستپێکرد کە کەسە ئەزمووندارەکان کۆ دەبوونەوە و ٥ بەهایان دیاری دەکرد کە بۆ

حوکمکردنی ڕەفتارەکانی خۆیان و ئەو کەسانەی لەوێ کاریان دەکرد بەکار دەهێنرا.

دوای ئەوە بەوردی خستیانەڕوو کە ئەو بەهایانە چۆن بەکاردەهێنن و کاری پێدەکەن لە چالاکییە بزنزی و کەسێتییەکانیاندا. هەرکاتێك پێویستکرابا هەر جۆرە بڕیارێك بدەن، ئەو لیستەیان دەردەکرد کە ٥ بەهاکە و چۆنیەتی دەربڕینی بەهاکانی تێدابوو، وە دوای ئەوە دانوستانیان دەکرد لەسەر ئەوەی ئایا ئاو بڕیارانەی داویانە بەتەواوەتی دەگونجێ لەگەڵ ئەو بنەما ڕێبەرییەی کە دانراوە.

کاتێك لەم کۆمپانیایە کارم دەکرد ئامادەبووم لە کۆبونەوەی ساڵانەیاندا، هەر زوو سەرسامبووم بەو باوەڕ بەخۆبوون و ئەرێنیەتە کە لە سەدەها کەسدا هەبوو کە کاریان بۆ کۆمپانیاکە دەکرد. ئەوان دڵخۆش و تاسەمەند و ماندوونەناس بوون بۆ سەرکەوتنی بزنزەکەیان.

## ٥٠٠ سەرکەوتووەکە

کاتێک کێن بلانکارد نۆرمان ڤینسنت پەیلّ لەکتێبەکەیاندا بە نێوی " هێزی بەڕێوەبەرایەتی ئەخلاقی"دا درێژەیان بە باسکردنی ٥٠٠ سەرکەوتووەکە دا و ڕوونتر لەسەری دوان، بۆیاندەرکەوت لە سەدا ٢٠ی ئەو کۆمپانیایانەی کە لە لووتکەدا بوون لە هەر پیشەسازییەکدا و بەوە ناسرابوون کە قازانجی زۆر دەکەن، کە هەندێك جار ڕێژەی قازانجەکەیان ١٠ بۆ ٢٠ ئەوەندەی پیشەسازییەکی ئاسایی بوو، تایبەتمەندییەکیان هەبوو، هەموویان بەهاگەلێکی ڕوون و ئاشکرا و نووسراویان هەبوو کە هەمووکەس دەیزانی و باوەڕیان پێی بوو و کاریان پێ دەکرد.

کۆمپانیاکانی تری هەمان پیشەسازی دەیانگووت ئێمەش بەهاگەلێکمان هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا بەهاکانی ئەم کۆمپانیایانە یا نەنووسرابوونەوە یان زۆر کەم کەس دەربارەی دەیانزانی بەهاکان چییە و ڕێژەیەکی کەمتریش دەیزانی ئەم بەهایانە چۆن بەکاردەهێندرێت لەگەڵ کەسی دەرەوە و ناوەوەی کۆمپانیاکەدا.

## مەبەست و مانا بەخشین جیاوازی دروست دەکەن

گرنگترین پێویستی مرۆڤ، لە ناوەڕاستی کەسایەتیدا ڕەگی داکوتاوە، بریتییە لە مانابەخشین بە ژیان و بە کارکردن. لە کارەکەی تۆدا، مەبەست و مانابەخشین وەڵامی پرسیاری " بۆچی ئەوە دەکەین کە دەیکەین؟"ە.

کاتێ چاوپێک کەوتن لەگەڵ کارمەندێکی نوێدا دەکەیت، دڵنیابە لەوەی کارەکەی پێ بناسێنیت لە ڕووی مانا و گرنگییەوە بۆ کەسانی دیکە. بەرهەمەکانت چ جۆرە جیاوازییەک دروست دەکەن لە ژیان و کاری کڕیارەکانتدا؟ بەرهەم و خزمەتەکانت چۆن ژیانی کەسانی دیکە دەگۆڕن و بەرەوپێشتری دەبەن؟

مەبەست و مانا بەخشین هەمیشە لە پێکهاتەی بەهای تاکەکەسەوە سەرهەڵ دەدات. لەبەر ئەوەیە کە زۆر گرنگە بۆت وەکوو بەڕێوەبەرێک ئەو بەهامانایە دووبارە و سێبارە شەنوکەو بکەیت کە دانراوە بۆ دەزگاکەت و خۆشت بڕوات پێیەتی. بەهاگەلێکی وەک کوالێتی، گەورەیی، هاوڕێیەتی،

خزمەت، ڕێزگرتن لە تاك، گەشەسەندنی کەسایەتی و ڕێزی خوودی و لێپرسراویەتییە کۆمەڵایەتییەکان پاڵنەرێکن مانی خەڵکی دەدەن و سروشتی پێ دەدەن.

کاتێك کەسێك هەست دەکات کە بۆ ئامانجێکی گەورەتر کار دەکات و جیاوازییەك دروست دەکەن لە ژیانی کەسانی دیکەدا بەجۆری ئەو کارەی دەیکەن، ئەو کات زیاتر هاندراو دەبن، بۆ ئەوەی باشترین بن.

## ڕامێنانی کردارەکی

١. لیستێك دروست بکە کە لە سێ بۆ پێنج بەهای گرنگ پێکهاتبێت کە بڕیارەکان و بازرگانییەکەت لەسەر بناغەی ئەو بەهایانە دابنێیت. لەگەڵ کەسانی دیکەدا قسە لەسەر ئەم بەهایانە بکەن و دڵنیابەوە لەوەی هەموو کەس دەزانێ بەهاکان چین.

٢. پێناسەی کارەکە لە ڕووی مەبەست و مانا بەخشینی بە لای تۆوە و ئەو جیاوازییانەی کە بەرهەم و خزمەتەکانتان دروستی دەکەن لە ژیانی کڕیاراندا. هەر لە یەکەم جارەوە دەبێت ئەم کارە بکەیت، لەبەر ئەم کارەیە کە تۆ لێرەیت.

# بەشی نۆیەم
# بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە

بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە یەکێکە لە بەهێزترین و ڕێکوپێکترین ماندەرەکان لە جیهانی کاردا. تەکنیکێکە کە پیتەر درەکەر بۆ یەکەمجار لە کتێبی " بەڕێوەبردن بۆ دەسخستنی ئەنجام "دا باسی لێوە کردووە. ئەم زاراوەیە بەمانای ئەوە دێت کارێک بەتەواوەتی بدەیت بە کەسێکی بەتوانا و لەهەمان کاتدا بوار بەو کەسە بدەیت بۆ هەڵبژاردنی چۆنیەتی کردنی کارەکە لەکات و لەسەر بودجەی دیاریکراودا.

**چوار هەنگاو بۆ بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە**

لێرەدا چوار هەنگاو دەخەینەڕوو بۆ بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە.

١. لێکتێگەشتنێکی ڕوون و ئاشکراتان هەبێت کە کام ئامانجە دەبێت بەدەست بهێندرێت: لەم هەنگاوەدا وا

پێویست دەکات ڕوون بێت لەبارەی ئامانجەکەتەوە و لەهەمان کاتدا نوشتۆك بێت لە پرۆسەی بەدەستهێنانیدا. بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە پێوستی بە دانوستانێکی تەواو و بەڕێوەبردنێکی بەشداریخوازە بۆ ئەوەی سازانێکی گشتی هەبێت لەبارەی کارەکە لەنێوان تۆ وەکوو بەڕێوەبەرێك لەگەڵ کارمەندەکە.

٢. لەگەڵ کەسەکەدا گفتوگۆی هەبوونی چەند ڕێگایەکی هەمەجۆر بکە بۆ گەیشتن بەئامانجەکە و بەئەنجامگەیاندنی کارەکە بکە: پشت بەست بە ئەزموونەکانت، بیرۆکە، پێشنیارەکانت و ئامۆژگارییەکانت دەدەیت لەبارەی باشترین ڕێگا بۆ بەدەستهێنانی کارەکە.

٣. پێوەر و هەڵسەنگێنەرێکی ڕوون دابمەزرێنە: وەکوو بەڕێوەبەرێك پێوستە بە کارمەندەکە ڕابگەیەنیت چۆن کارەکەی دەپێورێت و چەند هەڵسەنگێنەری هەمەجۆر بەکار دەهێندرێت بۆ دڵنیابوونەوە لە بەرەوپێشچوونی کارەکە لەکات و لەسەر بودجەی دیاریکراودا.

٤. ڕێ بکەون لەسەر خشتەیەکی دیاریکراو بۆ ڕاپۆرتپێدان و ڕاوبۆچوون دەربارەی بەرەوپێشچوونی

کارەکە: تەنها لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەڕێوەبەرایەتی لە ڕێگەی ئامانجەوە بەکار بهێنە کە پیشانیانداوە و سەلماندوویانە کە دەتوانن کارێك بەتەواوەتی ئەنجام بدەن بەبێ بوونی هیچ چاودێرییەك لەسەریان. کاتێك خاوەنی ئەم جۆرە کارمەندەیت، ئەوا لە ١٠٠٪ ی لێپرسراویەتیی بەجێهێنانی کارەکە بدە دەست کارمەندەکە خۆی.

## ئازادی و مافی بڕیاردانیان پێ بدە

دوو هاندەری بەهێز لە جیهانی کارکردندا بریتین لە ئازادی و مافی بڕیاردان. دەست لە دەست و بەیەکەوە گوزەر دەکەن. مرۆڤەکان پێویستە وەکوو تاکێك ببینرێن، لێپرسراوی بەئەنجامگەیاندنی کارەکەیان بن، وە هەروەها وەکوو تاکێك پێوانە بۆ ئاستی ئەداکردنەکەی بکرێت نەك وەکوو تیمێك. لەهەمان کاتدا مرۆڤەکان ئازادییەکی تەواویان دەوێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان بەپێی خشتەکەی خۆیان.

ئازادی و لێپرسراویەتیش دەست لە دەست گوزەر دەکەن. هەتا ئازادیی زیاتر بدەیت بە کارمەندەکانت،

دەبێت ئەوانیش ئامادەباشی ئەوەیان تێدا بێت لێپرسراویەتیی زیاتر وەربگرن بۆ ئەنجامدانی کارەکە لە ڕێگەی ئەو خشتەی خۆیان دایانناوە.

کاتێک کەسێک سەلماندی کە توانای هەیە کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات و لێپرسراویەتیی تەواوەتی بۆ کارەکە قبولکرد، ئەوا دەتوانی ئەوپەڕی ئازادییان بدەیتێ بۆ ئەنجامدانی کارەکە وە دەتوانی کارەکە بەسەر خۆیاندا بەتەنها بەجێ بهێڵیت، بەڵام ناوەناوە دەبێت پێداچوونەوە بۆ پێشکەوتنی کارەکە بکەیت.

بەڕێوەبەرایەتی بە ئامانجەکان کاتێکی باش دەگەڕێنێتەوە بۆ جێبەجێکارە بەتواناکان. هەتا ڕاپۆرتی زیاترت پێ بدرێت لەلایەن ئەو کەسانەی کە توانایان هەیە کارەکەیان ئەنجام بدەن بەبێ ئەوەی چاودێرییەکی ڕاستەوخۆی تۆیان لەسەر بێت، دەبێت زیاتر ئازادی بدەیت بەو کارانەی کە تەنها تۆ دەتوانی پێیان هەلبستیت. بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە ڕێگەیەکی باشە بۆ دروستکردنی باوەڕ بەخۆبوون لەلای ئەو کەسانەی کارت بۆ دەکەن، وە هەروەها یەکێکە لە

باشترین ڕێگاکانی بنیادنانی هزری و باوەڕی خودی. کاتێك کارمەندەکان ئازادن لەوەی خۆیان کارێکی ئاڵۆز ئەنجام بدەن و هەر لە ڕێگەی خۆیانەوە بەدەستی بهێنن، ئەوا نە تەنها ماندراوتر و زانخوازتر دەبن، بگرە ڕێزی خودیشیان زیاد دەکات. وە هەرکات کارێك بەئەنجام دەگەیەنن، هەست بە براوەیی خۆیان دەکەن.

تۆ بەڕێوەبەریت و کارمەندت هەیە کارت بۆ دەکات لەبەر ئەوەی پیشانتداوە کە توانای کردنی زۆربەی ئەو کارانەت هەیە کە ئێستا ناونووسی کەسێکی دیکی دەکەیت و کارەکەی پێ دەدەیت.

لەبەرەوە توانای خۆت لە کردنی کارێکی دیاریکراودا پیشانداوە، هەندێجار حەز دەکەیت لە کارێکدا بەشداربیت هەرچەندە داوتە بە کەسێکی دی، بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات. یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی بەڕێوەبەرەکان، ئەوەیە دوای پلە بەرزبوونەوە بۆ بەڕێوەبەر هێشتا هەر خەریکی ئەنجامدانی هەندێ کارە کە دەبێت بدرێت بە کەسێکی نوێ لە کۆمپانیاکە بۆ ئەوەی کاتی زیاتر بۆ بەڕێوەبەرەکە

[illegible]

[illegible]

[illegible]

[illegible]

کارێکە کە کەسێکی دیکە خەریکە دەیکات، ئەم کارەش بەوە دەکرێت کە بە شێوەیەکی بەردەوام پێشنیاری بۆ بدەیت یان فەرمانێک بدەیت کە کارمەندەکە ناچار بێت کارەکەی بەشێوەکەی جیاواز لەوەی لەسەری ڕێک کەوتوون ئەنجام بدات. وە ئەگەر ڕێنماییەکانی ئەنجامێکی [illegible]شی نەبوو یان کێشەیەک لە جێبەجێکردنیاندا دروستبوو، ئەو کارمەندەکە لە کارەکەی ڕادەوەستێت هەتا تۆ پێشنیار یان بڕیارێکی تر دەردەکەیت.

ڕێگایەکی سادە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا بەکاری دەهێنم. کاتێک کارمەندەکان دێن بۆ لام بۆ پرسیارکردنی شتێک کە پەیوەندی بە کارەکەوە هەیە، تەنها لێیان دەپرسم "بەڕای تۆ چی بکەین باشە؟" وایان لێ دەکەم کە بیر بکەنەوە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك یان پێشنیارێك بۆ ئەم ڕێگرەی بەردەمیان و بەسەریدا زاڵ

بن. هەموو کات کارمەندەکە دەگەڕێتەوە بۆ لات بۆ پێشنیارێك یان چەند پێشنیارێك بۆ ئەوەی خۆت لە بەربەستەکە ڕزگار بکەیت. وە هەموو جارێکیش من دەڵێم "بیرۆکەیەکی مەزنە".

دوای ئەوە یان هانیان دەدەم بۆ جێبەجێکردنی پێشنیارەکەیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، یان خۆم پێشنیارێك یان تێبینییەك زیاد دەکەم بۆ ئەوەی کاریگەریی بیرۆکەکەیان کاراتر بێت، بەڵام بە دەستی ئەنقەست ڕێگری لە خۆ هەڵقورتاندنی خۆم دەکەم بۆ ئەوەی ئەوان کارەکە لەژێر دەستی خۆیاندا و بە بەپرسیارێتیی تەواوی خۆیان کارەکە ئەنجام بدەن.

هەرکاتێك کەسێك تواناکانی خۆی پیشاندا لە کارێکی دیاریکراودا، ئەوا دەتوانی بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە لەگەڵیدا بەکار بهێنیت. ئامانجی تۆ ئەوەیە هەتا بتوانرێت بڕیار بدرێت و کردار بکرێت لەسەر کارەکە بۆ ئەوەی کاتت بۆ بگەڕێتەوە بۆ کارە گەورەکانی دی. بە بەکارهێنانی بەڕێوەبەرێتی لە ڕێگەی ئامانجەوە، دەتوانیت ئاستی بەرهەمهێنان و ئەداکردنی خۆت و کەسانی دی بەرز

بکەینەوە. گەر وات لە کارەکە کرد کێبڕکێکارانە و چێژبەخش بێت و تەواوی لێپرسراویەتیی کارەکە لەسەر کارمەندەکە بێت، ئەوا ئاستێکی بەرزی هاندانت لە تیمەکەتدا دروستکردووە.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. چاو بخشێنەرەوە بەو کارانەی کە کاتێکی زۆرت دەگرن و بیر لە ڕێگایەك بکەرەوە چۆن بیدەیت بە کەسێکی تر ئەنجامی بدات، بەم شێوەیەش هەستی باوەڕ بەخۆبوونیان و تواناداریان بەسەر کارەکەدا بۆ زیاد دەبێت و کاتێکی زیاتریش بۆ تۆ دەگەڕێتەوە.

٢. لیستێك دروست بکە بەو پێشنیارانەی کە لەم بەشەدا ئاماژەی پێ کراوە و هەرکات کارت دا بە کەسێك بەکاری بهێنە. هەتا بەتواناتر بیت لە بەکارهێنانی بەڕێوەبەرێتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە، ئەوا ئازادی و مافی ڕادەربڕینێکی زیاتر دەدەی بە کەسانی دی و ئازادییەکی زیاتر دەدەیت بە خۆت.

# بەشی دەیەم
# بەڕێوەبەرایەتی لە ڕێگەی هەڵاوێردکردن

کاری تۆ وەکو بەڕێوەبەرێك کردنەوەی ئەو لە ٥٠٪ توانایەیە کە کارمەندەکان لەناو ناخی خۆیاندا بەندیان کردووە. کاتێك دەگەی بەم ئامانجە کە هانی کارمەندەکانت بدەیت ئاستێکی باشتر پێشکەش بکەن لەبەر ئەوەی خۆیان دەیانەوێت، نەك لەبەر ئەوەی کە دەبێت بیکەن. ئەوەت بەبیر بێت کە ناتوانی هیچ کەسێك لە دەرەوەیەوە هان بدەیت. بەڵکوو تەنها دەتوانیت ژینگەیەك دروست بکەیت کە هانی کەسەکە دەدات بۆ ئەوەی لەناخیەوە هانی بدات هەتا ئاستێکی باشتر پێشکەش بکات.

هاندان لە ڕێگەی هەڵاوێردکردن یەکێك دەبێت لە ئامرازە گەورەکانی هاندان گەر لە هەر دەرفەتێکدا بەکاربهێنرێت. هاندەرێکی زەبەلاحی ئاستی ئەداکردنی کەسەکەیە لەبەر ئەوەی بنیادی توانا و باوەڕی کەسی زیاد دەکات. هەر لەم ڕێگەیەوە دەتوانی زیاتر لەوەی

دەتەوێت ئەنجامی بدەیت وە هەروەها کارامەیی و بەهرەی

ئەو کارمەندانەی کارت لەگەڵ دەکەن چەند جارە بکەیت.

## بهێڵە خۆیان کارەکە بکەن

بەڕێوەبەرایەتیکردن لە ڕێگەی هەڵاوێردکردنەوە کاتێک بەکار دێت کە کارێک بەڕوونی و بەتەواوی دەدەیت بە کەسێك. خۆت و کەسەکەی دی گفتوگۆ دەکەن و ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی چی بکرێت، چۆن پێوانە بکرێت و کەی بەدەست بهێندرێت. ئەگەر پێویست بێت خشتەیەك دادەنێن بۆ پێداچوونەوەی بەرەوپێشچوونی کارەکە. دوای ئەوە کەسەکە بەتەنیا بەجێ دەهێڵێت بۆ ئەوەی کارەکە ئەنجام بدات جگە لەو کاتانەی کە گۆڕانێك هەیە لەو ستانداردانەی کە لەسەری ڕێك کەوتوون یان شتێکی نەخوازراو ڕوو بدات.

ئەندامانی ستافەکەت تەنها لەو کاتانەدا ئاگادارت دەکەنەوە کە لادانێك بەدی بکرێت لە پلانەکەدا. هەتا کارەکان بەجوانی و بەڕێکی بەڕێوە بچێت ئاگادارکردنەوەی تۆ لەلایەن کارمەندەکانەوە هیچ پێویست

نییە. ئەگەر کەس هیچی پێ ڕانەگەیاندیت، دەکرێ وادابنێیت کە هەموو شتێك بەپێی پلانەکە دەڕوات.

بۆ نموونە، ئەگەر ئامانجەکەت فرۆشتنی ١٠٠ یەکە بێت لە هەفتەیەکدا، کەسی لێپرسراوی پڕۆژەکە تەنها لە کاتێکدا ئاگادارت دەکاتەوە گەر ڕێژەی فرۆشتن لە ١٠٠ یەکە کەمتر بێت. بێجگە لەو حاڵەتە، کارمەندەکەت پێویست ناکات بە هیچ شێوەیەك ڕاپۆرتت پێ بدات دەربارەی کارەکە. ئەو ئازادی و مافی بڕیاردانی هەیە لە کارەکەدا و بە ڕێگەی خۆی کارەکە ئەنجام دەدات.

لەگەڵ بەڕێوەبەرێتی لە ڕێگەی هەڵاوێردکردنەوە دەتوانیت ناوەناوە چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی کارەکە بپشکنی. بەڵام لەگەڵ بەڕێوەبەرێتی لە ڕێگەی ئامانجەکانەوە دەبێت ڕێگری لەو پاڵنەرە بکەیت کە وات لێ دەکات خۆت هەڵبقورتێنیتە ناو کارەکانیانەوە. هەتا ئازادی و لێپرسراویەتیی زیاتر بدەیت بە کارمەندەکانت بۆ ئەوەی کارەکە لە ڕێگەی خۆیانەوە ئەنجام بدەن، هاندراوتر و ئەرێنیتر دەبن.

بەڕێوەبەرایەتی لە ڕێگەی هەڵاوێردکردنەوە کاتێکی زیاترت بۆ دەگەڕێتەوە لەچاو بەڕێوەبەرێتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەکانەوە. هەرکاتێك خۆت لەوە ڕزگار بکەیت کە دەبێت بەبەردەوامی چاودێری و کۆنترۆڵی کارەکە بکەی بۆ ئەوەی بزانیت بەپێی خشتەکە دەڕوات، ئەوا کاتێکی زیاترت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی دیت بۆ گەڕاوەتەوە. وە هەر کاتێك ئەندامێکی ستافەکەت کارێکی ئەنجامدا ئەوەندە شانازی بە کارەکەیەوە بکات بڵێت " من ئەم کارەم ئەنجام دا ".

بەڕێوەبەری نایاب ئەوەیە کە بەبەردەوامی حاڵەتێك دروست دەکات کە کارمەندەکانی هەست بکەن کە کارەکە خۆیان ئەنجامیانداوە بە کەمترین ڕێنمای و لێپرسینەوە و ئاڕاستەکردن. لە ئەنجامدا هەست بە براوەیی خۆیان دەکەن، ئەرێنی و دڵخۆش دەبن. ئەوەندە تاسەمەند و ورە بەرزن کە دەیانەوێت کاری زیاتر ئەنجام بدەن. کۆنفۆشیۆس گوتویەتی نیشانەی ڕابەری سەرکەوتوو ئەوەیە کە کارەکە بە ئەنجامگەیەندرا، کارمەندەکان دەڵێن " ئێمە کردمان ". بەڕێوەبەرێتی لە ڕێگەی

هەڵاویردکردنەوە ئامرازێکە کە دەتوانی بەکاری بهێنیت بۆ گەیشتن بە هەموو ئامانجەکانی بەڕێوەبەرێتی و لەلایەن ئەو کەسانەی کە تواناکانی خۆیانیان پیشانداوە بە باشترین شێوە بەکار دەهێندرێت. ڕێک وەکوو بەڕێوەبەرێتیکردن لە ڕێگەی ئامانجەوە. وە تەنها کاتێک دەتەوێت ئەم تەکنیکە بەکار بهێنیت کە کەسەکە توانای خۆی پیشاندابێت بۆ کردنی کارەکە بەجوانی و ڕێکوپێکی.

## دوو پێویستیە بنچینەییەکە بەدەست بخە

بۆ پیشاندانی باشترینیان، کارمەندەکان پێویستیان بە دوو شتە لە جیهانی کاردا، یەکەمیان " پێویستی ماف ڕادەربڕین " یان " پێویستی من تایبەتم ". پێویستییەکە کە دەبێت ڕێزی لێ بگیرێت و بەرجەستە ببێت لە ئەدای کەسیدا. پێویستە پێی بزانرێت وەکوو دەسکەوتێکی کەسی.

دووەم پێویستی کە هەموو کەسێک هەیەتی لە شێوەی کاردا بریتییە لە " پێویستی پشت پێ بەستن ". خەڵکی دەیانەوێت بزانن کە پارچەیەکن لە شتێکی لە خۆیان

گەورەتر. خەڵکی دەیانەوێت ببن بە بەشێك لە تیم و ستاف. ئەبراهام ماسلۆو بە " پێویستی پەیوەندی " ناو دەبرد. پێویستە وەکوو بەشێکی تیمەکە رێزی لێ بگیرێت و پێی بزانرێت لە شوێنی کاردا.

کۆمپانیا و بەڕێوەبەرە باشەکان ئەوانەن ژینگەیەك دروست دەکەن کە خەڵکی هەست دەکات گرنگە و مافی بڕیاردانی هەیە، لە لایەکی تریشەوە پێویستی پشت پێ بەستنیان پڕکراوەتەوە، بەوەش وا هەست دەکەن بەشێکن لە تیمێك یان دەزگایەکی گەورەتر. لە دەزگا ناوازەکاندا سیستەمی خەڵاتکردن تەنها خەڵات نادات بە تاکێك، بەڵکوو دەشیدات بە ئەدایەکی گشتیش.

بەڕێوەبەرێتیکردن لە رێگەی ئامانج و هەڵاوێردکردنەوە ئەو دوو رێگایانەن کە کارمەند دەتوانێت مافی بڕیاردانی خۆیان بەدەست بهێنن کە هانیان دەدات بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئەداکردنیان.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. بەدوای هەموو دەرفەتێکدا بگەڕێ کە بتوانی بەڕێوەبەرێتیکردنی لە ڕێگەی هەڵاوێردکردنەوە تێدا بەکار بهێنیت. کارێک بدە بە ئەندامێکی ستافەکەت، و پێویستیش ناکات هیچ ڕاپۆرتێکت بداتێ لەسەر کارەکە گەر هەموو شتێك وەکوو پلانەکە بڕوات.

٢. دڵنیابەرەوە لەوەی ئەندامی ستافەکەت بگەڕێتەوە بۆ لای تۆ و داوای یارمەتی و ڕێنمایت لێ بکات گەر کۆسپێك هاتە ڕێگەی.

# بەشی یانزەیەم
# یاسای پاریتۆ بەکار بهێنە

کاتێک کەسێک هان دەدەیت بۆ پێشکەشکرنی ئەوپەڕی ئاستیان، یەکێک لە لێپرسراویەتییە هەرە گرنگەکانت بریتییە لەوەی بەشێوەیەکیان لێ بکەیت بەردەوام بیربیان لای دەستپێکردن و تەواوکردنی کارەکە بێت. بەئەنجامگەیاندنی کارێکی گرنگ سەرچاوەیەکی گەورەی وزە و جۆش وخرۆشی و ڕێزی خودیە.

سێیەم دەوڵەمەندترین پیاو، وارێن بەفێت، ئێوارەخوانێکی لەگەڵ بیلّ گەیتس و باوکی بیلّ گەیتسدا هەبوو. گفتوگۆیان لەسەر پێویستییە سەرەکییەکانی سەرکەوتن دەکرد، لە یەك کاتدا هەرسێکیان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە " تەرکیز و تەرکیز و تەرکیز " کلیلی بەدەستهێنانی ئامانجە گەورەکانە بەتایبەتی لە بازرگانیدا.

هاندان ئەو کاتە دەردەکەوێت کە کەسە بەهرەدارەکان لەسەر کارگەلێکی گرنگ کار دەکەن. دڵساردبوونەوەش کاتێك ڕوو دەدات کە کەسانێك بێئاگایانە لەسەر کارێکی کەم بەها کار دەکەن کە بەشێکی کەم لە هاندانی تێدایە و

هـەتا کارەکـەش بەتـەواوەتی جێبـەجێ نەکـەن پـارەی تەواوەی کارەکەیان وەرناگرن.

## یاسای ٨٠/٢٠

یاسای پارێتۆ کە ناسراوە بـە یاسـای ٨٠/٢٠ لەلایـەن ئابووریناسی ئیتالی ڤیلفرێدۆ پارێتۆوە لـە سـاڵی ١٨٩٥دا دۆزرایـەوە. دوای چـەندین سـاڵ لـە توێژینـەوە گەشـتە ئـەوەی کـە کۆمالگا دەکرێت بـە دوو بەشـەوە، یەکـەمیان ئەوانەی کە لە ٢٠٪ سەرەوە پێکهاتوون پێیان دەگوترێت (کەمـە گرنگەکـە) و دووەمـیش ئەوانەیـە کـە لـە ٨٠٪ ی خـوارەوە پێکهـاتوون کـە پێیـان دەگوترێـت ( زۆرە بێبایەخەکـە ). پـارێتۆ تێبـینی ئـەوەی کـرد کـە لـە هـەر کۆمەڵگایاکدا لـە ٢٠٪ ی کـەس و خێزانـەکان کـۆنترۆڵی لـە سامانی لە ٨٠٪ ی کەسەکانی خوار خۆیان دەکەن. وە لـە ٨٠٪ ی کەسـانی خـوارەوە تـەنها کـۆنترۆڵی لـە ٢٠٪ سامانیان دەکرد.

بۆ زیاتر لـە ١٠٠ سـاڵ یاسـای ٨٠/٢٠ لـە هـەموو بوارەکـانی چـالاکیە مرۆییەکانـدا بـەکارهاتووە، و واش

بەهەمان شێوە لە چالاکییە بازرگانییەکاندا بەکارهاتبێت. لە ۲۰٪ ی کڕیارەکانت بژاردەی لە ۸۰٪ ی فرۆشتن و قازانجەکانت دەکەن. وە لە ۲۰٪ ی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانت بژاردەی لە ۸۰٪ ی فرۆشتنەکانت دەکەن. وە لە ۲۰٪ کارمەندەکانت بژاردەی لە ۸۰٪ی فرۆشتن و ئەنجامەکانت دەکەن.

یاسای پارێتۆ دەتوانرێت بەکاربهێندرێت بۆ مەسەلەی تەرکیزکردن لەسەر کارە گرنگەکان. بەم شێوەیە لە ۲۰٪ ی چالاکییەکانت بژاردەی بەهای لە ۸۰٪ چالاکییەکانت و هەموو ئەو ئەنجامە دەکەن کە بەدەستی دەهێنیت. ئەمە مانای وایە ئەگەر لیستێك دروست بکەیت لە ۱۰ شت کە ئەمڕۆ دەیانکەیت، ئەوا دووانیان بەتەنها بەبەهاترن لەوانەی دی هەموویان.

## یاسای "سێ"

بەدرێژایی کارکردنم لەگەڵ خاوەنکار و جێبەجێکار و ستافی کۆمپانیا گەورە و بچووکەکاندا، بۆم دەرکەوت دەتوانیت "یاسای سێ" بەتەواوەتی بەکار بهێنیت لە

کارەکانتدا. یاسای سێ بەیانی ئەوە دەکات کە ئەگەر تۆ لیستی ئەو کار و چالاکییانە بنووسیت کە لە هەفتەیەک یاخود مانگێکدا ئەنجامی دەدەیت ( کە بۆ کەسێکی ئاسایی لەنێوان ٢٠ بۆ ٣٠ کاردا دەبێت )، بۆت دەردەکەوێت تەنها سێ لەو چالاکییانە بژاردەی لە ٩٠٪ی بەهای هەموو چالاکییەکانی دی دەکەن.

لەم کتێبەدا، گرنگترین وشە لە جیهانی کارکردندا بریتییە لە هاوکاریکردن. پێویستە لەسەر هەر کارمەندێك، لە هەر پلەیەکدا بێت لە کۆمپانیا، ئەوپەڕی هاوکاری و توانای خۆی بخاتەگەڕ لە کاتەکانی کارکردنیدا. وە تەنها سێ چالاکی کەسێك بژاردەی لە ٩٠٪ ی هاوکاری کەسەکە دەکەن.

ئەی باشە چۆن بەم سێ چالاکییە دەدۆزیتەوە؟ زۆر ئاسانە گەر " پرسیارە جادووییەکان " بکەیت.

## بەنرخترین چالاکیت دیاری بکە

پرسیاری یەکەم دەڵێت " ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژ بتوانیت تەنها یەك کار ئەنجام بدەیت، کام چالاکی زۆرترین سوود دەگەیەنێت بە بازرگانی و کۆمپانیاکەت؟ "

کاتێك تەماشای لیستی ئەو کارانە دەکەیت کە لە مانگێك یان هەفتەیەکدا ئەنجامیان دەدەیت، گرنگترین کار کاریگەری دەبێت لەسەرت. ئەگەر گومانت لەو گرنگترین کارە هەیە دەیکەیت، ئەوا یەکسەر ئەو گومانە بدۆزەرەوە. داوای ڕێنمایی لە بەڕێوەبەرەکەت بکە، پرسیار لە هاوپیشەکانت بکە، پرسیار لە خۆت بکە و ئەو گومانە بدۆزەرەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە دەبێت کارێك بکەیت بە گرنگترین و بەنرخترین کاری خۆت و ئەنجامی بدەیت.

دوای ئەوە کاتی ئەوەیە پرسیاری دووەم بکەیت، بەڵام تۆزێك جیاوازتر " ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژ بتوانم دوو کار ئەنجام بدەم، دووەم بەنرخترین شت چی دەبێت من دەیکەم؟". زۆربەی کات دوای چەند ساتێك لە خۆڕامان وەڵامەکەت بەڕوونی بۆ دەردەکەوێت. دوای ئەوە هەمان پرسیار جارێکی دیکە دەکەیتەوە " ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژ

بتوانم سێ کار ئەنجام بدەم، سێیەم بەسوودترین شت چی دەبێت بۆ کۆمپانیاکەمی بکەم؟ ".

دوای ئەوەی " سێ هەرە گرنگ "ەکەت دیاری کرد، دەست دەکەیت بە تەرکیزخستنەسەر کاتەکانت و ئەو سێ کارە، لە گزنگی بەیانییەوە هەتا درەنگانی شەو.

ئەمە یاسای باشترین هاوکارییە: کاری کەمتر ئەنجام بدە، بەڵام کارە گرنگەکان ئەنجام بدە، وە زیاتر خەریك ببە بە کردنیان و لە هەر یەکێکیاندا هەوڵی باشتربوونی خۆت بدە.

## یاسای " سێ " فێری کەسانی دیکە بکە

یەکێك لە کارە هەرە گرنگەکان ئەنجامی بدەیت وەکوو بەڕێوەبەرێك، گفتوگۆکردنە لەگەڵ کارمەندەکانت و یارمەتیدانیانە لە پێناسەکردنی سێ گرنگترین کاریان. کۆبوونەوەیەك ساز بکە کە هەر کەسە و گفتوگۆ بکات لەسەر لێپرسراویەتییەکانی ئەوانی دیکە. " فشاری پێڕی یان گرووپی " پاڵنەرێکی بەهێزە لە بازرگانیدا. کاتێك هەموو کەس دەزانێت ئەوانی دی دەبێت چی بکەن و

کارمەکەیان چەندێك گرنگە، فشارێکی سروشتی لەنێو دەزگاکەدا بۆ تەرکیز خستنەسەر کارە گرنگەکانی خۆت دروست دەبێت. لە کۆتاییدا هەموو کەس دەتوانن بەئاسانی ببینن ئایا کارمەندەکان بەڕاستی ئەو کارە گرنگانە ئەنجام دەدەن کە کۆمپانیاکە بەرەو پێشەوە دەبات!

## دووبارە یاسای ٢٠/٨٠

بۆ ئەوەی کارمەندەکان چێژ لە زۆرترین بەدەستهێنان و هاندانی کارەکەیان بکەن، پێویستە دڵنیابیتەوە لەوەی کارمەندەکان کار لەسەر ئەو لە ٢٠٪ دەکەن کە بژاردەی بەهای لە ٨٠٪ کارەکانیان دەکات. بەبەردەوامی جەخت لەسەر ئەم یاسایە بکەرەوە و دووبارەی بکەرەوە بۆ ستافەکەت. کارە هەرە گرنگەکانی بەشێوەیەکی ڕوون دیاری بکە بۆ کارمەندەکانت، بۆ ئەوەی هەمیشە سەرقاڵی کردنی ئەو کارانە بن کە زۆرترین نرخ دەدات بە کاتەکەیان.

یەکێك لە کارەکانت وەکوو بەڕێوەبەر، فێرکردنی کارمەندەکانتە بۆ شیکردنەوەیەکی بەردەوامی کارەکانیان وە دیاریکردنی کارە هەرە گرنگەکانیانە بە بەکارهێنانی یاسای پارێتۆ و یاسای سێ. لەبیرت بێت کە مرۆڤەکان تەنها لەو کاتانەدا ئەرێنی و ورەبەرزن کە کارێکی بەنرخ دەست پێ دەکەن و بەئەنجامی دەگەیەنن، کارێك کە جیاوازییەکیان بۆ دروست بکات و ڕێزیان لێ بگیرێت و پێبزانرێن بۆ ئەوەی ئەو هاوکارییەیان کردووە.

## لە لادانی تەرکیز دوور بکەوەرەوە

ئەمڕۆ گەورەترین دوژمنی کارمەندێکی ئاستبەرز لە جیهانی کاردا، لادانی تەرکیزە. مرۆڤەکان بە شتانێك دەورەدراون کە دەبنە هۆی لادانی تەرکیزیان، وەکوو ئاگادارکردنەوەی گەیشتنی ئیمەیڵێکی تازە، زەنگ و نامەی مۆبایل وە هەروەها سەرقاڵکردنی لەلایەن ئەو کەسانەی کە لە یەك شوێندا کار دەکەن.

کاری تۆ زیادکردنی ئاستی ئەداکردنی گرنگترین و بەبەهاترین سەرمایەتە، سەرمایەکەشت سەرچاوە

مرۆییەکانە. دەبێت بەردەوام جەخت بکەیتەوە لەسەر گرنگی کارکردنی کارمەندەکانت لەسەر بەبەهاترین کاریان و بەرنامەڕێژکردنی خۆیان، بۆ ئەوەی کارەکە لە کات و لەسەر بودجەی خۆی تەواو بکەن.

## ڕامێنانی کردارەکی

١. لیستێك دروست بکە لەو کارانەی کە لە هەفتەیەکدا یان مانگێکدا دەیانکەیت و دوای ئەوە، ئەو سێ پرسیارە جادووییە بکە لە خۆت دەربارەی کار و چالاکییەکانت. دەبێت بەتەواوی ڕوون بیت لەبارەی ئەو سێ گرنگترین کارەی کە لە ماوەی ڕۆژێك، هەفتەیەك یان مانگێکدا دەیانکەیت.

٢. گشت ئەندامانی ستافەکەت لە کۆبوونەوەیەکدا کۆ بکەرەوە و پێیان ڕابگەیەنە کە لیستی ئەو چالاکییانە بهێنن لەگەڵ خۆیاندا کە دەبێت ئەنجامی بدەن. یەك بە یەك یارمەتییان بدە بۆ ناسینی ئەو سێ گرنگترین کارەی کە دەیکەن و زۆرترین سوود بە دەزگاکە دەگەیەنن. دوای

ئەوە، هانی کارمەندەکانت بدە پێش هەموو شتێکی دی کارەکانیان دەست پێ بکەن و بەجێی بگەیەنن.

# بەشی دوازدە
# ببە بە مامۆستا

"بەنرخترین سەرمایەی داراییت چییە؟" لە زۆربەی سیمینارەکانمدا بەم پرسیارە نهێنییە دەست پێ دەکەم.

دوای ئەوەی ماوەیەك تێدەپەڕێت و خەڵکەکە بیر لە پرسیارەکە دەکەنەوە، پێیان دەڵێم " بەنرخترین توانای سەرمایەی رامیاریت توانای بەدەستهێنانتە، توانای بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامانەیە کە پارەی لەسەر وەردەگری".

لەنێو ئەو هەموو سەرمایەی کە لە کۆمپانیادا هەیە، تەنها کارمەندەکانی ناوی شایەنی ئەوەن بەرز بنرخێندرێن. گشت سەرمایە و سەرچاوەکانی دیکە بەپێی کات خراپ دەبن و دەپوکێنەوە. کاتێك کات تەرخان دەکەیت بۆ گەشەپێدانی کارمەندەکانت، ئەوا تۆ وایان لێ دەکەین کە بەها و نرخیان لە خزمەتکردن و بەدەستهێنای ئەنجامی باش بۆ کۆمپانیاکە بەرز ببێتەوە دەبیتە مایەی زیادکردنی بەهای کاریان لە دەزگاکەدا.

یه‌کێك له گرنگترین ڕۆڵه‌کانت وه‌کوو به‌ڕێوه‌به‌رێك فێرکردن و ڕاهێنانی کارمه‌نده‌کانته له چۆنیه‌تیی ئه‌نجامدانی کاره‌کانیانه به‌شێوه‌یه‌کی باشتر. له ڕۆڵی مامۆستایه‌کیندا یارمه‌تی که‌سانی دی ده‌ده‌یت، بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر هه‌ست به به‌ها و نرخی خۆیان بکه‌ن و توانایه‌کی زیاتریان هه‌بێت بۆ هاریکاریکردنی ده‌زگاکه، به‌م شێوه‌یه ده‌بێته هۆی به‌رزکردنه‌وه‌ی وره و هاندانیان.

## فێرکردن کاری تۆیه

کاتێك وه‌ك به‌ڕێوه‌به‌رێك ده‌ست به‌کاربووم، بۆ هه‌موو شوێنه جۆراوجۆره‌کان کارم ده‌دا به خه‌ڵکی. زۆرجار ده‌هاتن بۆلام و داوای ڕێنماییان لیّ ده‌کردم، بۆ ئه‌وه‌ی چۆن کاره‌کانیان ئه‌نجام بده‌ن و منیش وا بیرم ده‌کرده‌وه که کاره‌که ئاسانه و ده‌بیّ خۆیان ئه‌م شته بزانن، که کارمه‌نده‌کانم کاره‌کانمیان پیّ ده‌بڕیم، بووبوون به مایه‌ی بێزارکردنم.

دوای ئه‌وه ڕۆژێکیان بیرۆکه‌یه‌کم بۆ هات: فێرکردن کێشه‌یه‌ك یاخود لادانێکی ته‌رکیزی نییه له کاره‌کانم

بەڵكوو بەشێكی سەرەكی كارەكەمە. لەبەر ئەوە بووبووم بە بەڕێوەبەر چونكە من پێشتر ئەو كارانەم بە سەركەوتوویی ئەنجامدابوو، لەبەر ئەوە دەمتوانی تەركیز بخەمە سەر كاری ئاڵۆزتر و گرنگتر. هۆكاری سەرەكی ئەوەی كارمەندەكانم لەژێردەستی مندا كاریان دەكرد، نەزانینی چۆنیەتیی ئەنجامدانی كارەكە بوو لەلایەن كارمەندەكانەوە، بەڵێ نەیاندەزانی، بەڵام دەیانتوانی فێر بن.

## تەنانەت "MBA"یەكانیش پێویستیان بە ڕێنماییە

لە چەندساڵی پێشوودا دەرچوویەكی "MBA"م بۆ كارەكانم وەرگرت. ئەرێنی و دڵسۆز بوو، لەهەمان كاتدا لە كاری گران نەدەترسا و كەسێكی ڕێكخراو و بە دیسیپلین بوو.

لە ڕۆژی دووەمیدا بانگم كرد و داوام لێكرد ئامارێك لەسەر ئەو پرۆژەی خانوبەرە بكات كە خەریكی ئەنجامدانی بووین. سەرێكی ڕەزامەندی لەقاند و ڕۆشت بۆ

ئۆفیسەکەی هەتا کاری لەسەر بکات. دوای دوو ڕۆژ لەبارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکەوە پرسیارم لێکرد، ئەویش بە دەربڕینێکی ئازارایانەوە سەیری کردم وتی " لە ڕاستیدا نازانم ئامار چییە ".

لەلای من، ئامار بریتییە لە خەمڵاندنێکی سادەی ئەگەری سەرکەوتنی پڕۆژەیەك یان وەبەرهێنانێك. بە دیاریکردنی ئەو داهاتەی کە لە ڕێگەی ئەو پڕۆژەیەوە دەکرێت بەدەست بهێندرێت، کەمکردنەوەی تێچوو و بەدەستهێنانی داهات و گەشتن بە قازانج دەست پێدەکات. بڕی پارەی بەدەستهێندراو دابەش دەکرێت بەسەر ئەو پارەیەی لە پڕۆژەکەدا خەرجکراوە، بۆ دیاریکردنی بڕی قازانجکراو. پشت بەست بەم ڕێژەی بەدەستهێنانە کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست هەژمارکراوە، دەتوانیت دیاری بکەیت ئایا ئەم وەبەرهێنانەی خۆت باشە بەرانبەر دەرفەتەکانی تری وەبەرهێنان. ئامار خاڵی بنەڕەتیی گشت ژمێریارییە بازرگانییەکانە.

بەڵام لێرەدا ئەم دەرچووەی "MBA" کە نەیدەزانی چۆن ئامارێك یان خەمڵاندنێکی ئابووری ڕێك دەخرێت بۆ

بەرژوەی پرۆژەکە یان بەشێک لە پرۆژەکە، من بەهەڵە وام زانیبوو کە ئەو لەسەر ئەم پرۆژەیە پەروەردەکراوە و دەتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات. هەڵەی من ئەمە بوو.

## میچکات وادامەنیّ خەڵکی دەزانن

میچکات وادامەنیّ کارمەندانی ستافەکەت بزانن چۆن کارێکی ئاڵۆز و قورس بەڕێوە بەرن. ئەگەر بیانزانیایە، ئەوانەیە هەر لە یەکەم جارەوە بۆ تۆ کاریان نەکردبایە. بەرپرسیارێتیی تۆ دیاریکردنی ئاستی زانیاریی و ئەزموونیانە، وە ئەگەر لە بوارێکی تایبەتدا ئەزموون و زانیارییان بەپێی پێویست نەبوو، ئەوە ئەرکی تۆیە فێریان بکەیت و ڕاهێنانیان پێ بکەیت یان کەسێکی دیکە لە دەرەوەی شوێنکارەکە بهێنیت، بۆ ئەوەی ڕاهێنانی پێویستیان پێ بکات.

لە کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ وەڵامدانەوە و ڕێنماییکردن و پێدانی بیروبۆچوونەکانت. یەکێک لە گرنگترین بەرپرسیارێتییەکانت گەشەپێدان و فێرکردنی کەسانێکە بۆ بوون بە جیلی داهاتووی بەڕێوەبەر. وە

هەروەها فێرکردنی کەسانی دی بۆ ئەو کارانەی کە لە پێشوودا خۆت بەباشی ئەنجامتداون، لەوە ڕزگارت دەبێت خۆت بیکەیت و کاتت بۆ دەگەڕێتەوە.

فێرکردن چالاکییەکی گرنگی بەڕێوەبەرە. بنیادی توانا و باوەڕ بەخۆبوون لە ئەندامانی ستافەکەتدا دەکەیت و تواناکانی خۆت چەند جارە دەکەیت بۆ بەدەستهێنانی باشترین ئەنجامگەلێك لە کارەکەتداکە پێشبینیت کردوون. فێرکردنت هان و سروشت بە خەڵکی دەدات، بۆ ئەوەی بزانن کە ئەوان زیاتر گرنگن بۆ کۆمپانیاکە و بەم شێوەیەش توانای بەدەستهێنانیان زیاد دەکات.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. ئەو کارە گرنگانە دیاری بکە کە لە کاتی ئێستادا تەنها تۆ دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت، وە چاو بگێرە بۆ کەسانێك کە بتوانیت ئەم کارانەیان فێر بکەیت، بۆ ئەوەی ئەم کارانە ببن بە بەشێك لە کارەکانی ئەوان نەك هی تۆ.

٢. کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ پرسیارکردن لە ئەندامانی ستافەکەت هەتا بزانیت بەدیاریکراوی حەزیان لە

کام کارامەییە فێر ببن بۆ ئەوەی بتوانن خزمەت و هاریکارییەکی زۆرتری کۆمپانیاکە بکەن. بەدوای هەر دەرفەتێکدا بگەڕێ بۆ فێرکردن، ڕاهێنان و گەشەپێدانی کەسانی دی بۆ توانادارکردنیان لە بەدەستهێنانی ئەنجامێکی باشتر بۆ بازرگانییەکەت.

# به‌شی سیازده
# به‌به‌رده‌وامی ڕاهێنان و په‌روه‌رده‌یان بکه

کلیلی سه‌ره‌کی له هاندانی ئه‌ندامانی ستافه‌که‌ت، دروستکردنی ژینگه‌یه‌که که له کاتی کاردا هه‌ست به دڵخۆشی بکه‌ن تیایدا. هه‌تا زیاتر دڵخۆش بن باشتر کار ده‌که‌ن، زیاتر هاریکاری یه‌کدی ده‌که‌ن، زانخوازتر ده‌بن و ژینگه‌ی کاره‌که‌ت ئه‌رێنیتر ده‌بێت.

ئێرڵ نایتینگه‌یڵ وتوویه‌تی " دڵخۆشی، بریتییه له درکپێکردنێکی پێشکه‌وتوو بۆ ئامانجێکی به‌نرخ یان نموونه‌یی".

هه‌رکاتێك خه‌ڵك باوه‌ڕی وابێ که که‌سایه‌تییان گه‌شه ده‌سێنێت و باشتر و باشتر ده‌بن و به‌رده‌وام له‌به‌ره‌و پێشچووندان، بۆ ئه‌وه‌ی ببن به باشترینی ئه‌وه‌ی که هه‌ن، ئه‌زموونی دڵخۆشی و هاندان ده‌که‌ن، وه هیچ شتێك نابێته دروستکردنی ئه‌م هه‌ستانه جگه له خۆته‌رخانکردنت وه‌کوو به‌ڕێوه‌به‌رێك بۆ ڕاهێنان و په‌روه‌رده و گه‌شه‌پێکردنی کارمه‌نده‌کانت. فێربوونی به‌رده‌وام کلیلی

ئـەداكردن و وردبینیـەكی بـەرز و ئاسـتەمەندی و لێهاتوویان و ماندوونەناسـی گشـت كارمەندانـە. هـەركاتێك كەسێك نەزانێت چۆن كارێك ئەنجام بدات، ئەو كات تووشی ئازار چەشتنی كەمی ڕێزی خودی دەبێت، لەبەر ئەو هۆكارە كاری تۆ فێركردنە- وەك ئەوەی لە بەشی دوازدەهەمدا باسی لێـوە كـراوە. بابـەتی ئـەم بەشـە بـەس باسی ئەوە ناكات كە چۆن كارمەندەكانت بزانن كارەكانیان بەڕاستی و دروستی بـەڕێوە ببـەن، بـەڵكوو دەربـارەی كارمەندەكانتە كە چۆن بەبەردەوامی فێری شتی نوێ ببن لە بواری نوێدا، وە هــەروەها گەشــەپێدانی بــەردەوامی زانیــاریی و كارامەییــەكانی خۆیــان، بەمــەش دەبنــە هۆكــاری دروستبوونی ڕێگایانێك بۆ گەشـەپێدان لـە بـواری كەسـی و پیشەییدا لە داهاتوودا.

## پرسیارە ڕاستەكە

هەنـدێك لــە بەڕێوەبــەرەكان لــە بــارەی ڕاهێنــانی ئەندامانی ستافەكەیانەوە پرسیارێك دەكەن " ئـەی ئەگـەر ڕاهێنانمان پێكردن و ئـەوانیش بـەجێیان هێشتین؟"، ئـەم

پرسیارە هەڵەیە، پرسیارە ڕاستەکە ئەمەیانە " ئەی ئەگەر ڕاهێنانت پێ نەکردن و ئەوانیش لەوێ مانەوە؟".

کۆمپانیاکـــــــــــەلێکی وەك AT& IBM، زۆر بەتاسەمەندییەوە کار دەکەن بۆ ڕاهێنانی کارمەندەکانیان لەسەر بنچینەیەکی دیاریکراو. کارمەندێکی IBM، دوای ئەوەی کە بۆ خۆئامادەکردن بۆ کارەکە چەند مانگێك ڕاهێندراوە، پێویستە لە ماوەی هەر ساڵێکدا ٤٠ بۆ ٦٠ کاتژمێر کاری زیادە بکات. ئەمە کەمترین پێویستییە بۆ کارمەندێك بیەوێت لەوێ بەردەوام بێت. کارمەندەکان زۆر بەجدی ڕاهێنانەکانیان وەردەگرن.

باشترین کۆمپانیاکان ساڵانە بە هەزاران دۆلار تەرخان دەکەن بۆ ڕاهێنانپێکردنی کارمەندەکانیان، چونکە دەزانن ڕاهێنانێکی باش بەرهەمێکی زۆری دەبێت. بەپێی گۆڤاری Executive Resource Human Magazine، ڕاهێنانی کارمەندەکان بەشێوەیەکی شیاو لەو کارامەییانەدا کە هەیەتی، لە ساڵانی داهاتوودا دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی دە، بیست، بگرە سی جاری ئەو پارەیەی کە بۆ ڕاهێنانی ئەم کارمەندە سەرفکراوە. بۆ

هەر دۆلارێك كە كۆمپانیا سەرف دەكات بۆ ڕاهێنانی کارمەندێك، لەبەرانبەردا دەسکەوتێکی زۆر زیاتر وەردەگرێت بەرامبەر بەم وەبەرهێنانە.

## کارمەندەكانت بەبەهاترینن

جگە لە نرخی ئەو شتانەی فرۆشراوە، خەرجی کۆمپانیایەکی ئاسایی لە ٨٥٪ ی مووچە و قازانجە، تەنها لە ١٥٪ ی شتەکانی دیکەیە، بە خەرجی بەکرێگرتن و خزمەتگوزارییەکانیشەوە. تەنانەت بە خەرجی بەرهەمهێنانەکەشیەوە کۆمپانیایەکی ئاسایی لە ٦٥٪ ی داهاتەکەی سەرف دەکات لە مووچە و تێچووەکانی تردا.

بەپێی توێژینەوەیەك لە لایەن کۆمەڵگای ئەمریکی بۆ ڕاهێنان و گەشەپێدان، کۆمپانیاکان بە تێکڕایی لە ١٪ ی داهاتەکەیان بگرە کەمتریش تەرخان دەکەن بۆ ڕاهێنانپێکردنی ئەو کەسانەی کە ئەو داهاتەیان بۆ پەیدا دەکەن. بەپێی هەمان توێژینەوە، لە ٢٠٪ ی کۆمپانیا سەرکەوتووەکان لە هەر بوارێکی پیشەسازیدا لە ٣٪ یان زیاتری داهاتەکانیان تەرخان دەکەن بۆ ڕاهێنانپێکردنی

کارمەدەکانیان. ئەو کۆمپانیایانەی کە لە ٥٪ یان ١٠ ی داهاتەکەیان لە ڕاهێنانپێکردنی کارمەندەکانیاندا سەرف دەکەن ئەوا دەگەن بە بەرزترین ڕێژەی گەشەکردن و زۆرترین ڕێژەی قازانج لە بوارەکەیاندا.

لە بازاڕی گەرمی پارچەی خۆبزوێنەرەکاندا، کۆمپانیای دانا ناوبانگی دەرکردبوو بەوەی کە یەك ڕۆژ لە هەفتەیەکدا تەرخان دەکات بۆ ڕاهێنانی کارمەندەکانی لەو کارامەیییە بنچینەییانەدا کە پێویستیان بوو بۆ ئەنجامدانی کارەکەیان بەشێوازێکی نایاب. وە کۆمپانیاکە بەشێوەیەکی بەرچاو ئەدایەکی باشتر و ڕێژەیەکی زۆرتر فرۆشتنی هەبوو لەچاو ئەو کۆمپانیایانەی کە هەفتەی ٥ ڕۆژ کاری بە کارمەندەکانی دەکرد و کەمێك یاخود هیچ کاتی بۆ تەرخان نەدەکردن بۆ ڕاهێنانپێکردنیان.

## ڕاهێنان و هاندان

پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان ڕاهێنان و گەشەپێدانێکی بەردەوام، لەگەڵ ئەزموونکردنی هەستی گەشەسەندنی کەسێتی و زیادبوونی ڕێزی خودی کەسەکە.

هەرکاتێك کەسێك شتێکی نوێ فێر ببێت و ببینێت کە تواناکانی بەکارهێندراوە، ئەوا ڕێزی خودی بەرز دەبێتەوە وە هەروەها وێنەی خودیشیان زیاد دەکات. ئەرێنیتر و دڵخۆشتر دەبن.

یەکێك لە کارەکانی بەڕێوەبەرایەتیکردن پێویستە دانانی پلانێك بێت بۆ مەشقپێکردنی هەر ئەندامێکی ستافەکەی. لەگەڵ کارمەندەکانتدا دابنیشە و ئەو کارامەییانە دیاری بکە کە پێویستیانە، وە لەگەڵ ئەم کارامەییانەی ئێستایاندا، بۆ هاریکاریکردنێکی زیاتری بزنزەکە.

ئەگەر کار بۆ کۆمپانیایەکی گەورە دەکەیت، دەتوانیت ڕاهێنان هەر لەناو خودی کۆمپانیاکەدا بکەیت. ئەگەر لە کۆمپانیایەکی بچووکیش کار دەکەیت، ئەوا چەندین دەزگای ناوازەی مەشقپێکردن هەن کە دەتوانن مەشقپێکردنێکی گونجاو دابنێن بۆ کارمەندەکانت و بزنزەکەت. جاری وا هەیە تەنها یەك بەرنامەی مەشقپێکردن توانای گۆڕینی ئاستی ئەداکردنی بەشێك و بگرە دەزگایەکیشی بەتەواوەتی هەیە.

گەشــەکردنی بــەردەوامی کەســایەتی و پیشــەیی پشتپێبەستراوترین هاندەرە لە لایەن مرۆڤەکانەوە، وە دەیانبات بەرەو تواناگەلێکی دی و ئاستێکی بەرزتر لە ئەداکردنــدا. بێگومــان مەشــقپێکردنی کارمەنــدەکانت بنچینەی دروستکردنی کەشی کۆمپانیایەکی براوەیە.

**مەشقپێکردن سوودێکی کێبڕکێکارانەت پێ دەبەخشێت**

جێبەجێکارێکی ئەزموندار پێمی گووت " تەنها سوودێکی کێبڕکێکارانــە کــە ئێمــە هەمانــە توانــای فێربــوون و جێبــەجێکردنی بیرۆکەگــەلێکی نوێیــە بەخێراییــەکی زیاتر لەچاو پێشبڕکێکارەکانی تردا".

وەک چۆن تیمێکی سـەرکەوتووی وەرزشـی ڕاهێنـانێکی بەردەوام و تاقەتپڕوکێنیان هەیە، بەهەمان شێوە کۆمپانیا سـەکەوتووەکانیش بەهــەمان شـێوە بـن. یاسـاکە بـەم شێوەیەیە " تـەنها کاتێـک ژیانـت باشـتر دەبێت کە خۆت باشتر بیت".

بەهەمان شێوە، تەنها کاتێک کارمەندەکان باشتر دەبن کــە بەڕێوەبەرەکــەیان باشــتر ببێــت. وە تــەنها کاتێــک

کۆمپانیاکە باشتر دەبێت کە ستافەکەی باشتر ببێت. وەك پات ریلێی کە ڕاهێنەری یاری باسکەیە گوتویەتی " ئەگەر بەرەو باشبوون نەڕۆیت ئەوا بەرەو خراپبوون دەڕۆیت".
بەبۆنەی ئەو خێراییەی لە گۆڕان و کێبڕکێیەی کە لە هەموو بوارەکانی پیشەسازیدا هەیە لە ئەمڕۆدا، ئەگەر کارمەند و کۆمپانیاکەت بەبەردەوامی بەرەوپێشەوە نەچن و باشتر نەبن، ئەوا بەدڵنیاییەوە زۆر لە دوای ئەو کۆمپانیایانەوەیت کە مەشق بە کارمەندەکانیان دەکەن بۆ ئاستێکی بەرزتر.

ڕاهێنان و گەشەسەندێکی بەردەوام هەڵبژاردەیەك نییە وە ناتوانیت بە کەیفی خۆت بیکەیت یان نا بەڵکوو چالاکییەکی بەزۆرە، بۆ ئەوەی لە بازارەکانی ئەمڕۆ و بەیانیدا بژیت.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. پرسیار لە تاك بە تاکی کارمەندەکانت بکە بۆ دیاریکردنی کارامەییەك کە دەیانەوێت بەدەستی بهێنن یان لە ڕێگەی مەشقەوە پەرەی پێبدەن، بۆ ئەوەی خزمەتێکی

باشـتر بـە بزنزەکـە بکـات. دوای ئـەوە بـڕی پـارە و کـاتی پێویست بۆ کارامەییی هەر کارمەندێك تەرخان بکە.

٢. کارامەیییەك هەڵبژێرە بۆ خۆت کە بتوانیٚ یارمەتیت بدات لە باشتر ئەنجامدانی کارەکەتدا. خشتەیەکی ڕاهێنـان تایبـەت بـە خـۆت دابـنێ بـۆ خوێندنـەوە، گـوێگرتن لـە بەرنامـــەی دەنگـــی، ئامـــادەبوون لـــە ســـیمینار و وۆرکشـــۆپەکاندا و کـــارکردن بـــەو کارامەییـــە نوێیـــە لـــە شـوێنکارەکەتدا. تـۆ دەبیـت بـە نموونەیـەك کـە دەبیتـە مایەی هاندان و ورەبەرزی و سروشپێدانی کەسانی دیکە بۆ پەرەپێدانی کارامەیییەکانیان.

# بەشی چواردە
# جەخت لەسەر بنەمانی بەبێ هەڵە بکەرەوە

لە ٩٠٪ ی سەرکەوتنی بزنزەکەت دیاری دەکرێت بە تواناکانت بۆ بەرهەمهێنان و خزمەتێکی گەورە هەر لە یەکەم جاردا. لە توێژینەوەکانی ( Product Impact of Marketing Strategy)دا کە لە لایەن زانکۆی هارڤاردەوە بەڕێوەبراوە و سەدان کۆمپانیای گرتۆتەخۆ پیشانی دەدات کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لەنێوان کوالێتیی ئەو بەرهەم و خزمەتەی پێشکەشی دەکەیت لەگەڵ ڕێژەی قازانجکردنی کۆمپانیاکەت.

کۆمپانیاگەلێك زۆرترین قازانج دەکەن ، کە دەتوانن زۆرترین نرخ لەسەر کاڵاکانیان دابنێن و زۆرترین قازانج بکەن، ئەوانەن کە هەمیشە لە بازاڕەکاندا کاڵاکانیان وەکوو خاوەنی بەرزترین کوالێتی سەیر دەکرێت لە بواری کارەکەیاندا.

بەهەمان شێوە بۆ تاکەکانیش هەر بەو شێوەیەیە. ئەگەر دەتەوێ کارمەندەکانت وەك براوەیەك چاو لە

خۆیـان بکـەن، پێویسـتە ژینگەیـەك دروسـت بکـەیت کـە هانیـان بـدات، بـۆ ئـەوەی ببەنـەوە. وە بردنـەوەش لـە جیهـانی کارکردنـدا بـەمانای ئەنجامـدانی کـارێکی نـاوازەی کوالیتیی بەرز و پێـزانین بەرانبـەر کارمەندەکە لەبـەر ئـەم کارە.

## کوالێتی ئازادە

فیلیپ کرۆسبی لە کۆلێج کوالێتی و کتێبەکەیدا بـەناوی " کوالێتی ئازادە"، کوالێتی بـەم جـۆرە پێناسـە دەکـات " کوالێتی بەواتای ئەوە دێت کـە بەرهـەمێك یـان هـەر جـۆرە خزمـەتێکی تـرت فرۆشـت ئـەو کـارە بکـات کـە تـۆ بـە کڕیارەکـەت گوتـووە لـە کـاتی کڕینیـدا و بـەردەوام بێـت لەسەر کردنی ئەو کارە"

بەرزترین پێوانەی کوالێتی پێیـدەگوترێت " بەبێهەڵـە " یاخود " سفر هەڵە ". ئـەم پێوانەیـە بـەو مانایـە دێـت کـە بەرهەمەکەت هەمیشە بەو جۆرە دەبێت کە بـە کڕیارەکـەت گووتـوە لـەکاتی کڕینیـدا. بەهـەمان شـێوە تاکـەکانیش دەتـوانن پێوانەیـەك یـان ڕێژەیـەکی کـوالێتیی کەسـی

وەربگرن. کاتێ کارمەندەکانت کارەکانیان بەنایابی و سەد لە سەد لەکاتی خۆیدا دەکەن و لەسەریشی بەردەوام دەبن. ئەو کات پێوانەی " سفر هەڵە " وەردەگرن.

لەگەڵ بنەمای سفر هەڵەدا، تۆ هانی کەسانی دی دەدەیت بۆ تەرکیز خستنەسەر ئەنجامدانی کارێک و بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی فول کوالێتی. ئەگەر بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بیت، ئەوا کۆمپانیاکەت نموونەناسانە وەگەڕخستووە بۆ کارێکی ناوازە. وا لە کارمەندەکان دەکەیت هەمیشە بیر لە ئەنجامدانی کارێکی نایاب بکەنەوە

## پێوانەی خاوەن کوالێتی بەرز دابنێ

لەگەڵ بیرۆکەی سفر هەڵەدا، پێوانەیەکی کوالێتی لە ١٠٠٪ دادەنێیت. ئەمە بەمانای بێهەڵە یان بێخەوش دێت. دەتەوێت کە تواناکانی هەر تاکێک کارێک فول کوالێتی بەرهەم بهێنێت. هەر کاتێک کارێکت بینی کوالێتی تێدابوو، خەڵاتی بکە، پێیبزانە و هانی بدە.

وابااوە کاتێک کارمەندەکان باشترینی ئاستیان پێشکەش دەکەن کە بەڕێوەبەرەکان داواکارییان زۆر بێت.

بەڕێوەبەر ئاوازێك بۆ گشت دەزگاكە دادەنێت. لەبەر ئەم هۆیەیە هەڵوێستی بەڕێوبەر لەهەمبەر كوالیتی و ئاوازەیی پێوانەیەكی گشتی بۆ هەموو كەس دادەنێت.

## بیگەڕێنەرەوە

چیرۆكێكی بەناوبانگ هەیە دەربارەی هێنری كیسینگەر كاتێك سكرتێری هەرێم بووە. چیرۆكەكەش ئەوەیە داوای لە كارمەندێك كرد كە راپۆرتێكی بۆ بنووسێت لەسەر مەسەلەیەكی گرنگی نەتەوەیی. كارمەندەكە راپۆرتەكەی بۆ هێناو كیسینگەریش وتی سەیری دەكەم و سبەی وەڵامت دەدەمەوە.

سبەینێ كە كارمەندەكە هاتەوە، كیسینگەر راپۆرتەكەی دایەوە بە كارمەندەكە و گوتی كە كارەكەی بە پێی پێویست باش نییە و دەتوانێت كارێكی باشتر بكات ئەگەر كاتێكی زیاتری بۆ تەرخان بكات. كارمەندەكە رۆیشت، بۆ ئەوەی دوو سێ ڕۆژی دیكە كار لەسەر راپۆرتەكە بكات.

جارێکی تر راپۆرتەکەی هێنایەوە بۆ کیسینگەر، و ئەویش هەر ئەو شەوە پێداچوونەوەی بۆ کرد. ڕۆژی دواتر کیسینگەر راپۆرتەکەی گەڕاندەوە بۆ کارمەندەکە و پێی ڕاگەیاند کە کارەکە هێشتا بەتەواوی باش نییە. پێویستە زیاتر کاری لەسەر بکات بۆ ئەوەی کارێکی باش بەرهەم بهێنێت. جارێکی دیکە کارمەندەکە ڕاپۆرتەکەی بردەوە و بۆ دوو سێ ڕۆژی دیکە کاری لەسەر کرد.

لە کۆتاییدا کارمەندەکە گەڕایەوە بۆ لای کیسینگەر و پێی گوت کە ڕاپۆرتەکەی ئەمجارەیان باشترینە و ئیتر ناتوانێت لەمە باشتر بنوسێت. وە ئەگەر کیسینگەر ڕاپۆرتەکەی بەدڵ نەبوایە ئەوا کارمەندەکە نەیدەتوانی هیچ شتێکی دی بکات بۆ ئەوەی باشتری بکات.

دوای ئەم قسانە کیسینگەر وەڵامی دایەوەو و وتی "باشە، ئەگەر قایل بوویت کە ڕاپۆرتەکە لەمە باشتر نابێت، ئەوا منیش بۆ یەکەمجار دەیخوێنمەوە "

## ببە بە نموونەیەکی باش

لەپاڵ ئەوەی داوای کارێکی کوالیتیی بەرز دەکەیت لە کارمەندەکانت، دەبێت خۆت ببیت بە نموونەیەک کە کاری کوالیتیی بەرز پێشکەش بکەیت. تۆ ڕێبەری ڕێگاکەیت. کاتێک کارێکی نایاب دەکەیت کە بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونێکی زیاتری خۆتە، ئەو کات ستانداردێک دادەنێیت بۆ گشت ئەوانەی کە کارت لەگەڵ دەکەن و کارت بۆ دەکەن.

هەر کاتێک کەسێك کارێکی نایاب دەکات، ڕێزی خودی بەرز دەبێتەوە. هەرکاتێکیش کەسێك کارێکی ئاسایی دەکات و ئەوانی دیش کارەکە قبوڵ دەکەن، ئەو کات ڕێزی خودی هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نایەت وە هەرکاتێك کارێك دەکەن کە بە پێیی پێویست باش نییە و کەسانی دیش کارەکە قبوڵ دەکەن. ئەو کات ڕێزی خودی دێتە خوارەروە و کەم دەکات. هەر کاتێک کارمەندێك کارێکی ئاست نزم ئەنجام بدات، زۆیان بەکەم و بە بچووک دێتە بەرچاو.

هەر کاتێك کەسێك کارێکی شاز بکات و خەڵات بکرێت و پێی بزانرێت، ئەو کات وەکوو براوەیە تەماشای خۆی دەکات. زۆر کەم کەس هەن کە کارێکی شاز دەکەن مەگەر کەسێکی لەخۆیان گەورەتر پێوانەیەکیان بۆ دانێت و بە پێی ئەو پێوانەیە مامەڵە لەگەڵ کارەکانیاندا بکات. بنەمای سفر هەڵە نیشانێکی جوانە بۆ ئەوەی بیکەی بە ئامانج.

## بەهای کاری کوالێتیی بەرز

بە گەڕانەوەمان بۆ گفتوگۆی پێشوومان دەربارەی بەهاکان لە بەشی هەشتەمدا، گرنگە بە کارمەندەکانت بڵێیت کە سەرکەوتن و مانەوەی کۆمپانیاکەتان بەندە لەسەر کوالێتیی بەرهەمەکانتان. هانیان بدە، بۆ ئەوەی هەوڵ و تەقەلای ئەنجامدانی کارێکی ناوازە بدەن. تەنانەت لە شتە بچووکەکانیشدا وەکو نووسینی نامەیەك، ئیمەیڵێك یان کۆپی ڕیکلامێك، شتە بچوکەکان مانای زۆر دەبەخشن. بە جەختکردنەوە لەسەرئەوەی کە هەر پارچەیەکی نووسین یان پەیوەندییەك کە لە کۆمپانیاکەوە دەردەچێت

تەواو بێکێشەیە و سەلمێندراوە، ئەو کات تۆ پێوانەیەک دادەنێیت بۆ ناوازەیی کە بە هەموو دەزگاکەدا بڵاو دەبێتەوە.

وردی و ڕاستی و تەواوەتی سێ شتی بنچینەیین، کە دەبێت هەبێت کاتێک بەرهەمێك دەدەیت بە کڕیار یان بەئەنجامگەیاندنی داوایەکی کڕین و فرۆشتن. هەر کاتێک کەسێك هەر جۆرێك لە نووسینی بەرچاو بکەوێت کە پەیوەندی بە کۆمپانیاکەوە هەیە، ئەو کات کوالێتیی گشتی کۆمپانیاکە—وەکوو کارمەندەکانت و بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانت – بەڕاستی و دروستی سروشتی ئەو پەیوەندسیە دادگایی دەکات.

کاتێک کارمەندێکت کارێك دەکات کە لە سەرووی پێوانە و کوالێتییەکانەوەیە، بەرزی بنرخێنە. بەبیرت بێت هەر کارێك خەڵات بکەیت و پێی بزانیت و پشتگیری بکەیت، ئەوا ئەو کارە زۆرتر دێتەوە ڕێگەت. کاتێک بەبەردەوامی گرنگی ئەنجامدانی کارێکی ناوازە بیری کارمەندەکانت دەخەیتەوە، ئەوا تۆ نموونەیەکیان بۆ دادەنێیت کە کارمەندەکان زیاتر و زیاتر حەز بە کردنی

دەکەن. هەتا زیاتر حەز لە نموونەی کاری کوالێتی بەرز بکەن، وێنەی و ڕێزی خودییان زیاتر بەرز دەبێتەوە. تەنانەت ورەیان بەرزتر دەبێت بۆ ئەوەی کارێکی باشتر ئەنجام بدەن لە داهاتوودا.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١.چەند ستاندارێك دابنێ بۆ پێشکەشکردنی ئەدایەکی بەرز لە هەر کار و بەرهەمێکدا بەرانبەر بە کارمەندەکانت، وە دڵنیا ببەرەوە لەوەی هەموو کارمەندانی ستافەکەت بزانن ئەو ستانداردگەلە چین.

٢. ببە بە نموونەیەك کە کارێکی ناوازە لە هەر بەشێکی کاردا ئەنجام بدەیت و بەردەوام لە هەوڵداندا بە بۆ بەرەوپێشچوون لە کردنی کارە گرنگەکان.

# بەشی پازدە
# بازنە و تیمی کوالیّتی بناسیّنە

هەموو کارێك بە تیم دەکرێت. بەرەنجامی بەڕێوەبەر لە ڕاستیدا بەرەنجامی تیمە. هەتا تیمەکە گەرموگوڕتر و چالاکانەتر کار بکەن، بڕ و کوالیّتیی بەرهەمەکە زیاتر دەبێت، وە بەڕێوەبەر زیاتر تیمەکەی بەدڵ دەبێت، بەتایبەت کەسە جێدەستدیارەکانی ناو تیمەکە.

بازنەکانی کوالیّتی تەکنیککگەلێکی بەڕێوەبردنی یابانییە کە لە ساڵەکانی ١٩٦٠و ١٩٧٠کاندا پەرەی پێدراوە لە لایەن و. ئێدواردس دێمینگ کە یارمەتی یابانی دا بۆ ئەوەی وەکوو ڕێبەرێکی بەرهەم کوالیّتیی بەرز لە جیهاندا بناسرێت. بە قاڵبکردنی کارمەندەکان بۆ ناو تیم و بازنەی کوالیّتی ئەوا تۆ هانیان دەدەیت بۆ ئەوەی لێپرسراویەتییەکی گەورەتر وەربگرن بۆ بەرەوپێشبردنی کوالیّتیی هەر شتێك کە ئەنجامی دەدەن.

تیم و بازنەی کوالیّتی تەنها لە کاتێکدا جێدەستی خۆیان دیاری دەکەن کە پشتگیرییەکی ڕوون و ڕەوان لە

لایەن بەڕێوبەرەکەیانەوە وەربگرن. ناتوانرێت وەکوو ئامرازێکی هاندان و ورەبەرزکردنەوە بەکار بهێندرێت هەتا بەڕێوەبەر ڕوونی نەکاتەوە کە ئەگەر دەسپێکت بە کوالێتی بێت ئەوا چالاکییەکی زۆر گرنگت ئەنجامداوە بۆ کۆمپانیاکەت و وە بۆ ڕێژەی فرۆشتن و قازانجکردن لە داهاتوودا.

## تەنها ئەندامانی ستافەکە

تیمەکانی کوالێتی لە لایەن بەڕێوبەرەوە دادەنرێن، بەڵام تەنها لە ئەندامانی ستافەکە پێکدێت. هەر تیمێک لە گروپێک کارمەند پێکدێت کە خۆیان ڕابەری خۆیان هەڵدەبژێرن. کاری ئەندامانی تیمەکە ئەوەیە کە هەفتانە لە کاتی کارکردنیاندا کۆ ببنەوە و گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەن کە چۆن دەتوانن کوالێتیی کارەکەیان باشتر بکەن و وە کاروبار لەژێر لێپرسراویەتیی ئەواندا چۆن بەڕێوە دەچێت.

تیمەکانی کوالێتی دەبێت هانبدرێن بۆ کۆبونەوە لە کاتێکی دیاریکراودا هەتا چەند پرسیار و کێشەیەک

بخەنەڕوو کە پێویستی بە وەڵامێکی کرداری و بەرجەستە هەیە. تیمەکانی کوالێتی دەبێت لەسەر ئاستی بەشی خۆیان کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی بیرۆکەیان پێ بدرێت لەسەر چۆنیەتی باشترکردنی کوالێتی بەرهەم، مامەڵەکردن لەگەڵ داواکارییەکان، پرۆسێسکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ ئامارەکان و ئەو بوارانەی کە کاردەکاتە سەر ڕێژەی کڕیار و ناوبانگی کۆمپانیاکە.

خەڵاتێکی ئەمەریکی کە هاوتایە لەگەڵ خەڵاتی دێمینگدا – گەورەترین خەڵاتە کە کۆمپانایەك بتوانێت وەری بگرێت لە یابان– بە خەڵاتی باڵدریج ناودەبرێت. ئەم خەڵاتە لە لایەن ڕۆناڵد ڕیگنی سەرۆك وەزیرانەوە دانراوە و دواتر کراوە بە ناوی ماڵکۆم باڵدریج کە سکرتێری دارا بوو دانراوە.

هەموو ساڵێك کۆمپانیاکانی ئەمەریکا لە هەوڵ و تێکۆشاندان بۆ ئەوەی خەڵاتی باڵدریج بەدەست بهێنن. بۆ ئەوەی لە پێشبڕکێکەدا هەلێکی باشیان هەبێت دەبێت لە ٥٠٪ بۆ شەستی ئەو پرسیارانە وەڵام بدەنەوە کە لەبارەی وردەکاریی بەڕێوەچوونی کارەکەیانەوەیە. ئەگەر

وەڵامەکانیان بۆ دادوەرانی خەڵاتی باڵدریج قایلکەر بێت- لیژنەی دادوەران زۆرجار لە جێبەجێکارە گەورەکانی ئەو کۆمپانیایانە پێکدێت کە لە ساڵانی پێشوودا براوەی خەڵاتەکە بوون- ئەوا کۆمپانیاکە دەچێتە ناو کێبڕکێیەکی گەرمی دەنگدانەوە.

## بەڕێوبەرێتی بە پێوانەکردن

بەدرێژاییی چەندین ساڵ خەڵاتی باڵدریج تەرکیزی خستووەتەسەر " بەڕێوبەرێتی بە پێوانەکردن ". گشت چالاکییەکانی کۆمپانیا دەکرێن بە ژمارە و بەوریاییەوە پێوانە و بەراورد دەکرێن لەگەڵ ئاستی ئەداکردنی پێشوو لەگەڵ ئێستادا و لەگەڵ ئاستی ئەداکردنی کۆمپانیاکانی دی لە هەمان بواردا. ئامانجەکە بەرەوپێشبردنی ئەو ژمارانەیە کە کوالێتیی چالاکییەك لە بوارێکی دیاریکراودا دەردەخات بە کۆنترۆڵکردنی ژمارەکان.

کاتێك مرۆڤەکان ئامانجێکی ژمارەیی ڕوونیان لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی بەرەوپێشەوەی ببەن، ئەوا هاندراون بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی باشتر، خێراتر، ئاسانتر

و زانخوازانەتر بۆ ئەنجامدانی باشتر ئەنجامدانی کار لە هەموو بوارەکاندا. بە دانان و کۆکردنەوەی تیم و بازنەکانی کوالێتی بۆ تەرکیز خستنەسەر بەرەوپێشبردنێکی بەردەوام، بەڕێوەبەرایەتی دەبێتە هۆی دروستکردنی فشارێکی ناوەکی بۆ پێشکەشکردنی ئاستێکی باشتر کە تاکەکانی نێو پرۆسەکە هان دەدات و ئازادیان دەکات.

لە باشترین کۆمپانیاکاندا، هەموو کارمەندانی نێو دەزگاکە بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندییان هەیە بە تیمی کوالێتییەوە. هەر چالاکییەك کە کاریگەری هەبێت لەسەر ئاستی فرۆشتن و قازانجکردن و قایلبوونی کڕیارەکان لە بزنزەکە ئەوا بەبەردەوامی توێژینەوەی لەسەر دەکرێت و بەوردی دەپشکنرێت و لەهەمان کاتیشدا بەدوای ڕێگایەك دەگەڕێن بۆ باشتر ئەنجامدانی.

هەر کاتێك تیمی کوالێتی گەیشت بە بیرۆکە یان پێشنیارێك بۆ باشترکردنی کوالێتییەکە، ئەو کات ڕابەری گروپەکە بەشێوەی نووسینەکی ڕاپۆرتەکە دەدات بە بەڕێوەبەر.

## بەسەرکردنەوەی پاڵنەری ئێکس

کاتێك ئەندامانی تیمەکە بەبەردەوامی داوای بیرۆکە و بۆچوونیان دەکرێت بۆ بەرەوپێشبردنی کوالیتیی کارەکەیان، ئەو کات هەست بە گرنگی و بەهای خۆیان دەکەن و زیاتر هان دەدرێن بۆ ئەنجامدانی کارێکی باشتر لە داهاتوودا.

پاڵنەری ئێکست بیر بێتەوە، کە دەیگوت وێنەی خودی کارمەندەکان کاریگەرییەکی گەورەی دەکەوێتە سەر بەو ڕێگایەی کە بەڕێوەبەر و جێبەجێکارانی کۆمپانیا مامەڵەی لەگەڵ دەکەن. ئەگەر لە لایەن ڕێبەرانی دەزگاکەوە ڕێزیان لێ بگیرێت ئەوا ئەرێنیتر دەبن و لە ئەنجامدا ئاستی ئەداکردنیان بەرز دەبێتەوە. بەشداریکردنی تیم و بازنەی کوالێتی دەرخەرێکی دیاری ئەوەیە کە کۆمپانیاکان بەها و نرخ بۆ هاوکارییەکانیان دادەنێن. کاتێك کارمەندەکان دەزانن لە لایەن کۆمپانیاکەیانەوە ڕێز و گوێیان لێ دەگیرێت، ئەو کات کارەکەیان و کوالێتیی کارەکەشیان بە جدیتر وەر دەگرن.



Scanned by CamScanner

تیمەکانی کوالیتی دوو هاندەری کاریگەرن چونکە دوو پێویستی بنەڕەتی بەدەست دەهێنێت کە لە بەشی دەیەمدا باسی لێوەکراوە: ئەوانیش پێویستی پەیوەندی و ئازادیی ڕادەربڕینە. وەکوو مرۆڤێک هەر دوو پێویستی پەیوەندی و ئازادی ڕادەربڕینمان دەوێت. ئێمە کاتێ هەست دەکەین کە سەربەخۆین و ئەندامێکی تیمەکەین ئەو کات هاندەدرێین و پڕ لە وزە دەبین. هەرچەندە لە سروشتیدا وەکوو ئامۆژگاری هەیە، بەڵام تیمەکانی کوالیتی خود ئاڕاستەن، ڕێگەدەدات بە کارمەندەکان لەنێوان خۆیاندا کۆ ببنەوە و چەند بیرۆکەیەک ڕێک بخەن بۆ بەرەوپێشبردنی کوالیتیی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانی کۆمپانیاکە. ئەندامانی تیمی کوالیتی چێژ لە ئازادیی تاکەکەسی خۆیان لەناو تیمەکەدا و بوون بە بەشێک لە تیمەکە وەردەگرن.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. بوارێك لە بزنزەکەتدا هەڵبژێرە کە پەیوەندی هەیە بە قایلبوونی کڕیارەکان لە بەرهەمەکانت و تیمێکی کوالێتی ساز بکە بۆ پێدانی پێشنیار بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمپانیاکە لەو بوارەدا.

٢. چەند پێوەرێکی دیاریکەری کوالێتی لە هەر بەشێکی گرنگی بزنزەکاتدا دابنێ، وە بەدوای ڕێگایەکدا بگەڕێ بۆ بەرەوپێشبردنێکی بەردەوام و ناکۆتا لە هەریەك لەو بوارانەدا.

# بەشی شازدە
# لە کاتی دیاریکراودا بیرۆکەیان پێ بدە

بیرۆکەپێدان یەکێکە لە خێراترین ڕێگاکان بۆ بواردان بەو بیرکردنەوە زانخوازەی هەیە پەرەبسێنێت و بنیادنانی ماندان لەنێو هەموو دەزگاکاندا. وەکوو بەڕێوبەرێك یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئامرازانەی کە دەتوانیت بەکاری بهێنیت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و سەرکەوتن بەسەر ڕێگرەکاندا و بەدەستهێنانی ئامانجی بزنزەکەت، وە هەروەها بۆ بنیادنانی تیمێکی بەهێز کە لە کارمەندگەلێکی ماندوونەناس پێکهات بن.

پرۆسەی بیرۆکەپێدان بۆ یەکەمجار لە لایەن ئەلێکس ئۆسبۆرنەوە، کە جێبەجێکارێکی ڕیکلام بوو، لە سالّی ١٩٤٦دا ئامازەی پێکرا. لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا گەشەی پێدراوە و بەرەوپێشەوە چووە وە لە ئێستادا لە هەموو دەزگا کێبڕکێکارە خێرا گەشەسێنەرەکاندا بەکار دەهێندرێت. ئەگەر هێشتا پرۆسەی بیرۆکەپێدانت

بەکارنەهێناوە بۆ گەشەپێدانی بزنزەکەت، ئەوا دەتوانیت بە شێوەیەکی ئاسان دەست پێ بکەیت.

ئامانجی بیرۆکەپێدان فراوانکردنی بواری زانخوازیی هەموو کارمەندەکانی نێو دەزگاکەیە. وە هەندێ جار بەدڵخۆشییەکەوە سەرت دەسوڕمێ. هەندێجار ئەو ئەندامانەی کە زۆر بەشدارنیناکەن و ئاستیان بەرز نییە دەردەکەوێت کە بیرۆکەی گەورەیان هەیە کە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بزنزەکەت.

## ڕاهێنانی بیرۆکەپێدان

چەند ساڵێك لەمەوبەر (IBM) داوای لێکردم بۆ پێشکەشکردنی چەند سیمینارێك دەربارەی چارەسەرکردنی کێشە و بڕیاردان لە سەرانسەری وڵاتدا، وە منیش دوای ساڵێك ئامجامم دا. لە سیمینارە یەك ڕۆژییەکەدا یەکێك لە ڕاهێنانەکان فێرکردنی پرۆسەی بیرۆکەپێدان بوو. شەش بۆ حەوت لە بەشداربووانی سیمینارەکە لەسەر مێزێکی بازنەیی دادەنیشتن. دوای

شەوە من ڕاهێنانم پێ دەدان و ئەوانیش لەگەڵ یەکدا بەتەواوی دەدا.

لە ڕاهێنانی بیرۆکەپێدانـدا بەشـداربووان دەبوایـە زۆرترین بیرۆکەی گونجاویان بنووسیایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو. لەم حاڵەتـەدا کێشـەکە ئـەوە بـوو کارگەیەکی خشت هەزاران خشتی زیادەی بەرهـەمهێنابوو و نەیدەتوانی لە بازاڕەکانی ئـەمڕۆدا بیانفرۆشـێت. کارگەکـە بەدوای ڕێگاگەلێکدا دەگەڕا بۆ بـەکارهێنانی ئـەم خشـتانە جگە لـە بـەکارهێنـانی لـە دیـوار و لەگـەڵ چـیمەنتۆدا. بەشـداربووەکان بیسـت خوولـەکیان هـەبوو بـۆ نووسـینی زۆرتـرین بیرۆکـەی گونجـاو. هـەموویان کێبڕکێیـان لەگـەڵ یەکدیدا دەکرد بۆ بەگەڕخستنی زۆرتـرین ڕێـژەی بیرۆکـە و وەڵام بۆ کێشەکە.

لـە هـەر مێزێکـدا کەسـێك بـەخێرایی ئـەو بیرۆکانـەی دەنووسـییەوە کـە کەسـانی دی لەسـەر هـەمان مێـز دەیانگووت. ئەو بەشداربووانەی کە لەو پلـەدا لەیەك نزیك بوون لەگەڵ یەك و لەسەر یەك مێز کۆ بوبونـەوە. هەنـدێ مێز تایبـەت بـوو بـە بەڕێوەبـەر یـاخود جێبـەجێکارەکان،

مێزەکانی دی لە کەسی تەکنیکی پێکهاتبوون. بەبیرم دێ مێزێک لە حەوت سکرتێر پێکهات بوون، کە هەمویان ئافرەت بوون.

## چۆنیەتی بەرامبەر چەندێتی

بە سەرانسەری وڵاتدا گەشتم کرد بۆ وتنەوەی ئەم سیمیناری بیرۆکەپێدانە و تێکڕای ئەو وەڵامانەی کە لە مێزێکەوە وەرم دەگرت لە مەودای ڕاهێنانی بیرۆکەپێداندا بریتی بوو لە ٧٠ بۆ ٨٠ وەڵام و بیرۆکە، بەڵام لەم سیمینارە تایبەتەدا، ئەو مێزەی کە لە حەوت سکرتێرە ئافرەتەکە پێکهات بوو زیاتر لە ٢٠٠ بیرۆکەیان نووسی بۆ خۆنەجاتدان لەو خشتە زیادەیە. ئەوەنە بیرۆکەیان نووسیبوو لەماوەی بیست خولەکدا سێ لە حەوت بەشداربووی سەر مێزەکە خەریکی نووسینی بیرۆکەکان بوون. دەرکەوت کە ئەوان زۆر لەو مێزانە زانخوازترن کە لە بەڕێوەبەر و جێبەجێکار پێکهات بوون.

خاڵەکە لێرەدا ئەوەیە کە نابێت هەرگیز توانای زانخوازی کارمەندەکانت پێ کەم بێت. هەندێک جار تەنها

یەك كەس بیرۆكەیەكی پێیە و سەرلەبەری ئاراستەی بزنزەكەت دەگۆڕێت، ئەگەر بێت و توانای زانخوازی ئەو كەسە بەكار ببەیت.

## حەوت بەشەكەی پرۆسەی بیرۆكەپێدان

١. باشترین قەبارەی گرووپ دیاری بكە: قەبارەی نموونەیی بۆ بیرۆكە پێدان بریتییە لە چوار بۆ حەوت كەس. لە چوار كەمتر یاخود لە حەوت زیاتر، یان بیرۆكەی پێویست بەگەڕناخرێ، یان هەموو بەشداربووەكان دەرفەتی ئەوەیان نابێت بیرۆكەكانیان بخەنە ڕوو.

٢. ڕێبەرێك و نووسەرێك دابنێ بۆ مێزەكە: كاری ڕێبەرەكە ئەوەیە بەردەوامی بدات بە پرۆسەكە و دڵنیاببێتەوە لەوەی كە هەموو بەشدابووەكان بواری ڕا دەربڕینیان هەیە و كەس زاڵ نەبووە بەسەر گفتوگۆكەدا. كاری نووسەرەكەیش نووسینی ئەو بیرۆكانەیە یەكسەر دوای بەگەڕخرانیان. بواری تەواو بدە بە بەشداربووەكان، بۆ ئەوەی هەڵبژاردنەكانی خۆیان بكەن پێش ئەوەی ڕاهێنانە دەست پێ بكات.

٣. کاتێکی دیاریکراو دابنێ بۆ ڕاهێنانی بیرۆکەپەیدانەکە: پێشنیاری پازدە بۆ چل و پێنج خولەک کراوە. لەکاتی دیاریکراودا دەست پێ بکە و کۆتایی پێ بهێنە. ئەگەر کارمەندەکان کاتەکەیان دیاریکراو بێت، ئەوا تەرکیزیان زیاتر دەبێت و بیرۆکەی زیاتر بەگەڕ دەخەن.

٤. باسی کێشەیەک یان پرسیارێکی دیاریکراو بکە کە پێویستی بە وەڵامێکی کرداری هەیە: پرسیاری "چۆن دەتوانین کڕیارەکان بۆلای خۆمان ڕابکێشین؟" زۆر باشترە لە پرسیاری "چۆن دەتوانین کڕیارەکانمان دڵخۆش بکەین؟" هەتا پرسیارەکە دیاریکراوتر بێت وەڵامەکە بەنرختره.

٥. زیاتر تەرکیزت لەسەر ژمارەی بیرۆکەکان بێت نەک چۆنیەتیان: وەکوو یارییەک یان تاقیکردنەوەیەک بۆ بەگەڕخستنی زۆرترین بیرۆکە بەخێرایی و لەو کاتەی کە دیاریکراوە.

٦. گشت دادوەرییەکان ڕابگرە: تەنها تەرکیزت لەسەر بەگەڕخستنی بیرۆکە بێت. لە کاتی ڕاهێنانەکەدا هیچ تێبینییەکی خۆت مەڵێ لەسەر بیرۆکەکان و هیچ

بیرۆکەیەکیش بەکەم مەزانە. هانی بیرۆکەی نائاسایی بدە. لەسەر بیرۆکەکانی کەسانی دی چارەسەرەکە بنیاد بنێ. بیرۆکەکان تێکەڵ بە یەکدی بکە بۆ دروستبوونی بیرۆکەی زیاتر. ئەگەر بەشداربووەکان چێژ لە ڕاهێنانەکان ئەبینن و پێکەنن بە بیرۆکەکانیان بزانە هەڵەیەك هەیە.

٧. لە کاتێکی تردا بڕیار لەسەر بیرۆکەکان بدە: ئەم هەنگاوە نیشانی ئەوە دەخاتەڕوو کە هیچ خودپەرستییەك نییە لە ڕاستبووندا یان بیرۆکەی کەسێك گرنگتر نییە لە بیرۆکەی ئەوانی دی.

## چۆنیەتی کارکردنی بیرۆکەپێدان

دوای ئەوەی هەر مێزێك پەنجا بۆ هەشتا وەڵامیان بۆ پرسیارە دیاریکراوەکە نووسی، ڕاهێنانەکە بوەستێنە و پشوویەك وەربگرن. دوای پشوو وەرگرتنەکە با نووسەری هەر مێزێك بیرۆکەکانی مێزەکەی بدات بە ڕابەری مێزەکەی تەنیشتی، وە ڕابەرەکەش گفتوگۆ و هەڵسەنگاندنێك دەکات بۆ ئەو بیرۆکانەی لە لایەن مێزەکەی ترەوە بەگەڕخراوە.

لەم حاڵەتەدا، هیچ بوارێک نییە بۆ خودپەسەندی، چونکە خاوەن بیرۆکەکە بێ چەندوچوون بیرۆکەکەی نووسراوەتەوە و گفتوگۆی لەسەر نەکراوە. لەکۆتاییدا باشترین بیرۆکە کە لە لایەن هەموانەوە دیاریکراوە، لەلایەن هەر میزێکەوە بۆ تەواوی گروپەکە دەخرێتە ڕوو.

ئەگەر هەشت کەس یان زیاتریش بەشدارییان کردبێت لە یەک میزدا. ئەوا من هەر ئەم ڕێگایەم بەکارهێناوە بۆ ئەنجامدانی ڕاهێنانەکە. دوای ئەوە دەتوانی هەموو بەشداربووەکانیش بکەیت بە دوو گروپ یان زیاتر، وە هەر گروپێکیش بیرۆکەی گروپەکەی دی هەڵبسەنگێنێت.

## سوودەکانی بیرۆکەپێدان

سوودەکانی بیرۆکەپێدان لەژمارە نایەت. بیرۆکەپێدان پرۆسەیەکی دڵسۆزی و ماندوونەناسی و تاسەمەندی و بەرپرسیارێتییە بەشداریکردن لەم ڕاهێنانانەدا دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگای بەهرە زانخوازەکانی مرۆڤ. ... دەبێتە هۆی دروستکردنی ڕێزی خودی لەبەر

ئەوەی کەسەکان داوای بیرۆکە و بەشداریکردنیان لێ دەکرێت.

لەگەڵ بیرۆکەپێدانندا دەتوانی کەشێکی باشتر فەراهەم بکەیت بۆ کارکردن لەگەڵ یەکدی. هەرکاتێک کەسەکان لەگەڵ یەکدا لە چالاکییەکانی بیرۆکەپێداندا کاربکەن ئەوا پەیوەندی و هاوڕێیەتی لەنێوانیاندا زیاد دەکات. گرنگترین بەرهەمی ئەوەیە کە دەبێتە خاوەن چەندین بیرۆکە کە هەندێک جار ئاراستەی بزنزەکەت دەگۆڕێت. لە ئەزموونی خۆمەوە ڕاهێنانەکانی بیرۆکەپێدان بووەتە هۆی بەرهەمهێنانی بیرۆکەگەلێکی دەرەجە یەک بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی قازانج و فرۆشتن لە دەزگادا.

لێپرسراویەتیی سەرەتایی بەڕێوەبەرەکان ئەوەیە کە ئاوەناو ڕاهێنانی بیرۆکەپێدان بەکار بهێنن. ئەگەر ئێستا بەکاری ناهێنێت، ئەوا هێزێکی ئێجگار گەورەی بواری بەڕێوەبەرایەتیت فەرامۆشکردووە و هێزی مێشکی بەنرخترین سەرچاوەی کۆمپانیاکەت بەفیڕۆ دەدەیت.

کاتێک لەکاتێکی دیاریکراودا ڕاهێنانی بیرۆکەپێدان بەکاردەهێنیت، بۆ نموونە هەفتەی جارێک، سەرسام

دەبێت بەو ژمارە زۆرەی بیرۆکە کە کەسێکی ئاسایی دەتوانێت بەرهەمی بهێنێت بۆ یارمەتیدانی کارەکەت و بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەت بەشێوەیەکی باشتر.

## ڕاهێنانی کرداری

١. ئەمڕۆت تەرخان بکە بۆ کارکردن بە ڕاهێنانێکی بیرۆکەپێدان بەو شێوەیەی لەم بەشەدا باسکراوە. تەواوی ڕێنماییەکانی لەسەر کاخەزێك بنووسە، بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت چی دەکات و چۆن دەیکات.

٢. لەئێستاوە هەر کێشە یان پرسیارێکت هەبوو لە بیرزەکەتدا، دەستبەجێ تیمی بیرۆکەپێدان کۆ بکەرەوە بۆ ڕاهێنانێکی پازدە بۆ چل و پێنج خولەکی، بۆ ئەوەی تەرکیز بخەنەسەر دروستکردنی زۆرترین بیرۆکەی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. لە ئەنجامەکەی سەرت دەسوڕمێ.

# بەشی حەڤدە
# ببە بە فێرکار

هیچ کەس بەتەنها ناتوانێت بیکات. ئەوەی ئەمڕۆ سەرکەوتووە، لە ئەنجامی بیرۆکە و ڕێنمایی و ژیری ئەو کەسانە سەرکەوتووە کە لە ژیانی پیشەییدا هاتونەتە ڕێی. هەندێك جار ئەو فێرکارییە ڕاستەوخۆ دەبێت، وەکوو گفتوگۆی تایبەتی نێوان فێرکار و فێرخواز بە ئاماجی یارمەتیدانی تاکەکە بۆ دیاریکردنی ئەو بەشانەی کە پێویستی بە بەرەوپێشچوون هەیە و بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکە و کارامەییی نوێ لەو بەشەدا.

هەندێ جاریش فێرکاری ناڕاستەوخۆ بە. ئەمەش بەدەست دێت بە کارکردن لەگەڵ کەسی ئەزموندار کە ژیریی و ئەزموونێکی زیاتریان هەیە و فێر بوون لە ڕێگەی تێبینیکردنی ئەو شێوازەی ئەوان مامەڵە لەگەڵ کار و لێپرسراویەتییەکەیان. باشترین فێرکار کە لە هەموو ژیانمدا هەم بووە جێبەجێکارێکی ئەزموندار بوو، کە هەرگیز خۆی بە ڕاستەوخۆ فێری نەکردم. لەجیاتیی ئەوە دەی

بردمە ناو کۆبونەوەیەکەوە لە کێشە دیارەکان باس دەکران و بڕیارە گرنگەکان دەر دەکران. ئەوەی لە تەماشاکردنی ئەوانەوە فێر بووم هێشتا کاریگەری لەسەرم ماوە.

## بەردەوام گرنگیان پێ بدە

یەکێك لە بەهێزترین پاڵنەرەکانی هاندان لەجیهانی کارکردندا بریتییە لە گرنگیدانێکی بەردەوام بە پیشەی ئەو کارمەندانەی لات کار دەکەن، لەبەر ئەوەی کارت زۆرە و مەژغوڵیت، لەوانەیە پێت نەکرێت کاتی زۆر تەرخان بکەیت بۆ قسەکردن لەگەڵ کارمەندە کەم ئەزموونەکاندا، لەجیاتیی ئەوە دەتوانیت ببیت بە فێرکارێك کە لە ماوەی چەند خولەکێکدا ڕێنماییان پێ بدەیت و ئاراستەیان بکەیت.

ئەگەر زۆر سووریت لەسەر ئەوەی ببیت بە فێرکارێك، لە کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ هەڵبژاردنی یەك یان دوو کارمەندی کۆمپانیاکەت و بۆیان ببە بە هاوڕێ و ڕاوێژکار و ڕێبەر و ڕاهێنەر. دەتوانیت ئەو کەسانەی کە هەڵیان

دەبژێرێت لەژێر دەستی خۆتدا کار بکەن و نزیکت بن، یان تەنانەت لە بەشێکی دی کار بکەن. یەکێك لە فرمانە هەرە سەرەکییەکانت وەکوو بەڕێوەبەرێکی ئەزموونـدار، دیاریکردنی کەسانێکی گەنج و بەهرەدار و چاوبرسییە بۆ یارمەتیدان و ڕێبەریکردنیان لە پیشەکەیاندا.

یەکێك لە تایبەتمەندییە قەشەنگەکانی فێرکاری، بریتییە لە گرنگیپێدان لە لایەن کارمەندێکی ڕێزلێگیراوی کۆمپانیاکەوە، کە دەبێتە هۆی دروستکردنی ڕێز و باوەڕی خودی بۆ کەسەکە. ئەو کەسەی کە فێر دەکرێت خۆی بە گرنگتر و بە بەهاتر دێتە بەرچاو، خۆی زیاتر تەرخان دەکات و ماندوونەناسانە کار بۆ کۆمپانیاکە دەکات. گرنگیپێدان بە تاك لە لایەن کەسێکی گەورەتر لەخۆی، هاندەرێکی سەرەکی گەشەکردنی کەسایەتیی و ئاستی پێشکەشکردنە.

## گرنگیپێدان، بەها دانانە

یاسایەکی بنەڕەتی هەیە کە دەڵێت هەر کاتێك گرنگیماندا بە کەسێك ئەوا بەهاشی پێ دەدەین. ئێمە

یارمەتی کەسانی دیکە دەدەین بۆ بەرزکردنەوەی ڕێزی خودییان و خۆیان بە گرنگتر ببینن. کاتێك بەهایەکی لەم جۆرە دەدەیت بە کارمەندێکی کەم ئەزموونت بە گرنگیدان بە ژیان و داهاتووی، ئەوا ئەو کارمەندە دڵسۆزانەتر و ماندوونەناسانەتر دەبن بۆت و کارەکەشت بەباشتر بۆ بەڕێوە دەبەن.

زۆربەی جێبەجێکارەکانی ئەمڕۆ بەبەردەوامی ئەوە دووبارە دەکەنەوە کە بەهۆی گرنگیپێدانی جێبەجێکارێکی ترەوە بووە کە ئەم جیاوازیانەی لە ژیان و پیشەیاندا دروستکردووە. دەکرێت بۆ تۆش بەهەمان شێوە بێت.

یەکێك لە گەورەترین خەڵاتەکان بۆ سەرکەوتوییەکەت وەکوو بەڕێوەبەرێك ئەوەیە چەند کەس بڵێن، کە تۆ گەیاندووتن بەم ڕۆژەیان. زۆربەی بەڕێوەبەرە گەورەکان کاتێك ڕازیبوون لە ژیانی خۆیاندا بەدی دەکەن کە ببینن بوونەتە هۆی بەرەوپێشبردنی کەسانێك، کە بۆ چەندین ساڵ فێرکاریان بوون.

## سەرنجی سەرەکی لە فێرکاریدا

فێرکـردن هــەروا شـتێکی سـادە نییـە کەسـێك کـەم ئـەزموون بهێنیـت و ئامۆژگـاری پـێ بـدەیت و یارمـەتییان بدەیت لە کارەکەیاندا. یەکەم سـەرنج هەمیشە بریتییە لە گونجـان و سـازان. بـۆ ئـەوەی پەیوەنـدی نێـوان فێرکـار و فێرخواز کاری خـۆی بکـات، دەبێـت هـەردوولا لەگـەڵ یـەك بسازێن و بحەوێنەوە لەگەڵ یەکتر.

لە ڕابردوودا فێرکاری زۆرم بینیووە کە هـەر لـە یەکـەم جارەوە بۆم دەرکەوتووە کە بـە یەکـەوە نـاگونجێین. هـەم مـن و هـەم کەسـەکەی دیـش لەگـەڵ یەکدی نەدەسازاین. بــەرە بــەرە ڕوونبــووەوە کــە پەیوەندییــەکی فێرکــەر و فێرخوازێکی باشمان نییە.

کەسـی تـریش هـەبووە لـێم نزیکبوونەتـەوە بەمەسـتی ئـەوەی بـبم بـە فێرکـەریان، لـە هەنـدێ حاڵەتـدا ڕۆڵـی فێرکـارێکم بـۆ ئـەو کەسـانە بینیـووە بـۆ مـاوەی مـانگ و تەنانەت ساڵانێکیش. لە هەندێ حاڵەتی دیکـەیش، هـەر لـە یەکـەم دیـدارەوە دیـار بـوو کـە پەیوەندییـەکی باشمـان

نابێت، وە منیش وەکوو فێرکارێک پەیوەندیم نەبووە پێیانەوە.

## کاتی خۆت تەرخان بکە

ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ کەسێکی سەروو خۆتدا پەیوەندییەکی فێرکاری و فێرخوازیتان هەبێت، ئەوا لە کاتێکی گونجاودا لێی نزیک ببەرەوە، بۆ نموونە لەگەڵ قاوە خواردنەوەیەکدا بۆی ڕوون بکەرەوە، کە زۆر خۆشحاڵ دەبیت گەر جارجارە ئامۆژگاری و ڕێنمایی لێوەر بگریت بۆ ئەنجامدانی کارەکانت. ئەگەر فێرکارەکەش ئەم بیرۆکەیەی بەدڵ بوو و هەردووک لەگەڵ یەک دەنگونجان، ئاگات لێبێت زۆر داوای لێ نەکەیت و کاتەکان بۆ خۆت تەرخان نەکەیت. با وانەکانی فێرکاریت دە خولەک بێت.

کاتێک یەکتر دەبینن لەگەڵ فێرکارەکەتدا، لیستێکی پرسیار و کێشە و تێبینی ئامادە بکە بۆ گفتوگۆکردن لەسەری. دڵنیابەرەوە لەوەی کۆپییەکت پێیە بۆ فێرکارەکەشت. کاتێک فێرکارەکەت پێشنیاری خوێندنەوەی کتێبێک یان بەشداریکردن لە خولێکت بۆ

دەکات، دەستبەجێ هەستە بە ئەنجامدانی پێشنیارەکانی ئەوەی فێربوویت و ئەنجامت داون بە فێرکارەکەتی بڵێ. تۆ دەتەوێت ئەوە بکەیەنیت لە فێرکارەکەت کە کات بەسەربردن لەگەڵ تۆدا دەستمایەیەکی باشە بۆ داهاتوو.

## ڕێنمایی فێرخوازەکەت بکە

کاتێك بوویت بە فێرکار، ئەو یاسا و بەرنامانە ڕوون بکەرەوە بۆ فێرخوازەکەت، بۆ ئەوەی کاریگەرییەکەت وەکوو فێرکارێك زیاتر بێت. با فێرخوازەکەت لیستێکی ئەو پرسیار و کێشانەی هەیەتی بە نووسین بۆی بهێنێت. خشتەیەك دابنێ بۆ کۆبوونەوەکانتان، با لە دە خولەك تێپەڕ نەکات، ئەگەریش کاتت هەبوو با زیاتر بێت. کاتێك دیاری بکە بۆ دەستپێکردن و کۆتاییپێهێنان. لەکاتی دیاریکراودا ئامادە بە و لەکاتی دیاریکراویشدا کۆتایی بە کۆبوونەوەکە بهێنە.

یاسای پارکینسۆن دەڵێت " کارکردن فراوان دەبێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو کاتەی، کە بۆی تەرخانکراوە ". ئەگەر دە یان پازدە خولەك تەرخان بکەیت بۆ وانەی

فێرکارییەکەت، و فێرخوازەکەشت ئاگادار بێت بەمە، ئەوە سەرسام دەبیت بەوەی کە چۆن بەخێرایی فریای ئەو هەموو بابەتە دەکەون لە کاتێکی کەمدا.

بوون بە فێرکار و بوون بە فێرخواز دەتوانێت هەگبەی ئەزموونی ژیانت دەوڵەمەندتر بکات. وەکوو فێرکارێك دەتوانیت کاریگەرییەکی وات هەبێت لەسەر کارمەندە نوێ و کەم ئەزموونەکانت، ئەگەر هەتا کۆتاییی ژیانیان ئەو کاریگەرییەیان لەسەر نەبێت، ئەوا بۆ ماوەی چەندین ساڵ بەسەریانەوە دەبێت.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. کەسێك دیاری بکە لە تیمەکەت کە توانایەکی نایاب پیشان دەدات و کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ کۆبونەوە لەگەڵی، بەلایەنی کەمەوە دە خولەك لە هەفتەیەکدا. پێی بڵێ کە تۆ ئامادەیت بە هەر جۆرێك بێت لە پیشەکەیدا یارمەتی بدەیت.

٢. سەیرێکی دەوروبەری خۆت بکە و کەسێك هەڵبژێرە کە بەدڵنەو ستایشی دەکەیت، کەسێك کە لە بوارەکەتدا لە

خۆت زیاتر شارەزاتر و بە ئەزموونترە. کۆ ببەرەوە لەگەڵ ئەو کەسەدا و داوای لێ بکە ئەگەر لە مانگێدا یەك بۆ دووجار بتوانیت ئامۆژگاری لێوەربگریت. دەکرێ ئەمە ببێت بە سەرەتای هاوڕێیەتییەکی جوان و قەشەنگ.

# بەشی هەژدە
# وەکوو ڕابەرێك نموونە بە

یەکێك لە گرنگترین لێپرسراویەتییەکانی بەڕێوەبردن بریتییە لەوەی کە وەکوو نموونەیەك ڕابەرایەتییەکەی بکات و ببێت بە مۆدێلێك بۆ ئەندامانی ستافەکەی. یارمەتیدانیان بۆ ئەوەی ببن قالبی خودی نموونەی خۆیان بەشێوەیەك بکەن کە خۆیان بەدڵیانە و ڕێزی لێ دەگرن.

ڕابەرایەتیکردن وەکوو نموونەیەك پێویستی ڕەهای بەڕێوەبردن و بنچینەی ڕابەرایەتیکردنە. تایبەتمەندی و ئاستی ئەداکردنی خەڵکی لە شوێنکاردا هەرگیز لەو ڕەفتار و پێوەرانەی بەڕێوەبردن بەرزتر و باشتر نابێت. خۆشت بەشێکی لە بەڕێوەبردنەکە.

تۆ وره بەرز ناکەیتەوە لەناو دەزگادا، بەڵکوو وره لە سەرەوە دەڕژێتە خوارەوە. پشت بەستە بە تایبەتمەندیی و کەسایەتیی ڕابەر یان بەڕێوەبەر. وتە و کردارەکانی بەڕێوەبەر ئاوازێك دادەنێن بۆ تەواوی دەزگاکە، ئەگەر

ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی، ئەگەر بەرهەمدار بێت یاخود بێبەرهەم.

## پرسیارە گەورەکە

یەکێك لە پرسیارە هەرە گەورەکان بریتییە لە "کۆمپانیاکەی من چ جۆرە کۆمپانیایەك دەبێت ئەگەر هەموو کەسەکانی ناوی وەکوو من بن؟"

لە بازرگانیدا، شتێك لە لایەن گشتیەوە قبوڵکرا بێت ئەوەیە، کە کارمەندەکان بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکاندا بکەن کە لە لایەن بەڕێوەبەرەکەیانەوە مامەڵەیانە لەگەڵ دەکرێت. هەرکاتێك مامەڵەیەکی باشت بینی لەگەڵ کڕیارەکاندا ئەوە دەزانیت کە بەڕێوەبەرێکی نایاب هەیە کە بەشێوەیەکی زۆر باش گرنگی دەدات بە کارمەندەکانی. هەر کاتێکیش مامەڵەیەکی خراپت بینی لەگەڵ کڕیارەکاندا، ئەوا دەزانیت کە بەڕێوەبەرێکی خراپ و نەرێنی هەیە لەپشتەوە. لەبەر ئەوەی ناتوانن لەبەرامبەردا مامەڵەیەکی خراپ لەگەڵ بەڕێوبەرەکانیاندا

بکەن، دێن و داخی دڵی خۆیان بە کڕیارەکان دەڕێژن. هەموو جارێك شتی لەم جۆرە دەبینیت.

چارەسەرەکەشی ئەوەیە کە کەسایەتییەکی گەرموگوڕ، هاوڕێیانە و هاندەر دروست بکەیت لەگەڵ کەسانی دەوروبەرت. تۆ کەشێکی ئەرێنی دروست دەکەیت لە دەزگاکەتدا بەوەی خۆت ئەرێنی و ئاسوودە و باوەڕ بە خۆبوو بیت.

لە بواری کارکردندا، بەڕێوەبەر و ئەو کردارانەی بەڕێوەبەر دەیکات، کاریگەرییەکی ناڕاستەوخۆی هەیە لەسەر بیر و هەست و ڕەفتار و هەڵوێستی ستافەکەی. وشەیەکی ئەرێنی و هاندەر دەتوانێت وا لە کەسێك بکات دڵخۆش و بەرهەمدارتر بێت بە درێژایی ڕۆژەکە. لە لایەکی ترەوە، وشەیەك یان تێبینییەکی نەرێنی یاخود ڕووگرژییەك لە بەڕێوەبەرەوە دەتوانێت وا لە کەسەکە بکات بەدرێژایی ڕۆژ قەلەق و باوەڕ بەخۆنەبوو بن و بێبەرهەم بن. ئەو شتەی کە دەیڵێیت یان دەیکەیت وەکوو بەڕێوەبەرێك، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر کەسانی دی هەیە.

## هەموو کەس تەماشا دەکات

هەموو کەس، هەموو کات چاوی لە بەڕێوەبەرەکەیە. مرۆڤەکان سەیرت دەکەن و تۆش ئاگات لێ نییە. هەر شتێك بە هەر کەسێك بڵێیت یەکسەر دەگوازرێتەوە بۆ گشت کەسەکانی دی. وە هەموو کەس هەموو شت دەزانێت. هیچ نهێنییەك نییە لە بازرگانی یان ڕێکخراوێکدا. ئەگەر تێبینییەکی ئەرێنی یان نەرێنی بدەیت لەسەر کەسێك، تەنانەت بۆ خۆشیش بێت ، ئەوا ئەو تێبینییە زۆر زیاتر لەسەری دەکەوێت لەوەی بیرت لێ کردۆتەوە. زۆربەی جاریش لەبەر تێکدانی ئەوەی تۆ گوتونە وایان لێ دێت.

لە کاتی کۆبونەوەدا تۆ لەبەر چاوانیت و هەموو کەس تەماشای تۆ دەکات. هەموو کەس ئاگای لەوەیە چی دەڵێیت و چی دەکەیت، تەنانەت ئاگایان لەو شتانەشە کە فەرامۆشیان دەکەیت و نایانکەیت.

یەکێك لە باشترین ڕێگاکان بۆ ئەوەی وەکوو نموونەیەك دەر بکەوی، ئەوەیە ئەرێنی بیت. هەر کاتێ قسە دەکەیت بۆ ئەندامانی ستافێك لە بارەی ئەندامانی

ستافەکەی تر، هەمیشە بە ئەرێنی باسیان بکە و بەرزیان بکەرەوە. هەر کاتێك ستایشی کەسێك دەکەیت کە ئامادە نییە، ئەوا ئەو ستایشەت بەخێرایی پێی دەگات و کاریگەریی ئەرێنی هەیە لەسەر باشترکردنی ڕێز و وێنەی خودی.

## کاتی تاقیکردنەوە

باشترین کات بۆ ئەوەی ببیت بە نموونەیەك، ئەو کاتەیە کە کێشەیەك دێتە ڕێت، کاتێك لەژێر فشاردایت و شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویداوە لە ڕێکخراوەکەدا. ئەم دۆخە پێی دەڵێن " کاتی تاقیکردنەوە "، وە ئەمە کات و شوێنێکە کە تایبەتمەندیی ڕاستەقینەی خۆت پیشان دەدەیت. ئەمە ئەو کاتەیە کە بە هەموو کەسی نیشان دەدەیت تۆ لە ناخەوە چۆنیت.

لە ساڵی ٢٠١٠دا تووشی شێرپەنجەی قورگ بووم. بۆ یەکێك کە بەقەد بیست کەس بزنزی دروستکردووە بە قسەکردنی پرۆفیشناڵانە و سیمینار و تۆماری دەنگی و ڤیدیۆیی، شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو ئەم شێرپەنجەی قورگە.

لە هەمان کاتدا، درکم کرد کە ئەم نەخۆشییەم کاریگەری هەیە لەسەر بیرکردنەوەی کارمەندەکانم بۆ کارەکەیان، بیرکردنەوە لەوەی ئایا کارەکەیان پارێزراوە. کارمەندەکان هەمیشە لە بیری داهاتەکانیاندان.

بەخۆشحاڵییەوە پزیشککەلێکی نایابم هەبوو و نەخۆشییەکەم بەیەکجاری چارەسەرکرا. پزیشکەکانم نەخۆشییەکەیان لە قۆناغی یەکەمیدا گرت بوو، هەرچەندە پێویستم بە نەشتەرگەری و کیمۆگرافی و تیشک لێدان هەبوو، بەڵام ئەمانە هیچ مەترسییەکیان بۆ لەدەستدانی ژیانم دروست نەدەکرد.

ئەو کاتەی هەستم بە گرنگی حاڵەتەکەم کرد، قسەکردنم لەگەڵ هەر کارمەندێکدا لە هەر هەفتەیەکدا کردبوو بە پیشەی خۆم. بەبەردەوامی بەئەرێنی و گەشبینی و ئاسوودەی مامەوە. پێم وتن، کە چی لە ئارادایە و چۆن چارەسەر دەکرێم و چی ڕوودەدات و کەی دەنگم لەدەست دەدەم و بۆ ماوەی چەنێك و هەموو وردەکارییەکانی دی.

لەئەنجامدا هەرچەندە کامەندەکان خەمیان بوو، بەڵام بەردەوامیان دا بە ئەنجامدانی کارەکەیان بە ئەرێنی و بەشێوەیەك وەکوو ئەوەی هەموو شتێك ئاسایی بێت.

## دەرفەتێك بۆ پیشاندانی کەسایەتیت

هەرکاتێك کێشەیەك یان قەیرانێکت بۆ دروستبوو لە کارەکەتدا بەبیرت بێت هەموو کەس چاوی لەسەر تۆیە. ئەمە دەرفەتێکە بۆ پیشاندانی تایبەتمەندسی و کەسایەتیت وەکوو بەڕێوەبەرێك. کاری تۆ ئەوەیە کە کاردانەوەکەت نەرێنی نەبێت و نەترسیت لە هەر حاڵەتێکی نەرێنیدا، بەڵکوو دەبێت کاردانەوەت ئارام و کاریگەر بێت و وا لە هەموو کەس بکەیت کە تەرکیزیان لەسەر دۆزینەوەی چارەسەرێك بێت.

وەك بەڕێوەبەرێك گەر دەتەوێت کامەندەکانت چالاك بن و لەکاتی دیاریکراودا لە کار بن و جێدەستیان لە کارەکەدا دیار بێت، ئەوا دەبێت خۆشت چالاك بیت و لە کاتی دیاریکراودا لەسەر کار بیت و جێ دەستت بەسەر کارەکەوە دیار بێت. کاتەکانیشت بەباشی بەڕێوە ببە.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. یەکێك لە ڕەفتارەکانت هەڵبژێرە، بۆ نموونە وەکوو ئامادەبوون لەکاتی دیاریکراودا لەسەر کار، کە بتوانیت بیگۆڕیت، بۆ ئەوەی تایبەتمەندیی و کەسایەتیی خۆت وەکوو بەڕێوەبەرێك پیشان بدەیت، ڕەفتارێك کە یارمەتی کارمەندەکانت بدات بۆ باشتربوونیان.

٢. ئەمڕۆ تەرخان بکە بۆ ئەوەی بە ئارامی و ئەرێنی و ئاسوودەیی بمێنیتەوە لە کاتێکدا کە کێشەیەك دروست دەبێت، لەبەر ئەوەی هەموو چاویان لەسەرتە.

# بەشی نۆزدە
# گوێ لە ستافەکەت بگرە

ڕابەرەکان ئەوانەن گوێ دەگرن. باشترین ڕابەرەکان چەندێك قسە دەکەن دوو هێندە گوێ دەگرن. پرسیاری زۆر دەکەن لە ستافەکانیان و بواری پێ دەدەن بە ڕاشکاوانە و دڵسۆزانە لەکاتی دیاریکراودا بیرۆکەکانیان دەربڕن.

دەتوانیت پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەندەکان بەوە دیاری بکەیت کە چۆن کارمەندەکان ئازادانە بیروڕاکانیان دەخەنەڕوو بەبێ ئەوەی بترسن ڕەخنەیان لێ بگیرێت یان فەرامۆش بکرێن.

لە توێژینەوە ساڵانەییەکانی (GreatPlacetoWork.com) دا ، یەکێك لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی باشترین کۆمپانیاکان بریتییە لە هەبوونی ئاستێکی باوەڕی بەرز. باوەڕ بەواتای " من دەتوانم بیرۆکەکانم بەئازادانە بۆ بەڕێوەبەرەکەم بخەمەڕوو و بێ ئەوەی بترسم کارەکەم لەدەست بدەم یاخود ڕەخنەم لێ بگیرێت.

## گوێگرتن پاڵنەرێکی بەهێزە

گوێگرتن پێی دەگوترێت " جادووی سپی "، لەبەر ئەوەی کاریگەرییەکی جادوویانەی هەیە بۆ ئەوەی خەڵك هەست بە گرنگبوونی خۆیان بکەن. کاتێك گوێ لە کەسانی دی دەگریت، مانای وایە بە بەهایان ئەزانی، وایان لێ دەکەیت زیاتر هەست بە گرنگی و بەنرخی خۆیان بکەن.

بەتێکڕا بەڕێوەبەرەکان لە ٦٠٪ ی کاتەکانیان لە کۆبوونەوە و قسەکردن لەگەڵ کارمەندەکان و کەسانی پلە بەرزدا بەفیڕۆ دەدەن. هەتا باشتر گوێ بگری، زیاتر دەزانی چی دەگوزەرێت، زووتر هەست بە کێشە دەکەیت، بۆ ئەوەی یارمەتییان بدەیت لە چارەسەرکردنیاندا وە بە بوونی تۆ لەو شوێنەدا کارمەندەکان زۆر ئاسوودە دەبن و باوەڕیان بە خۆیان دەبێت.

## چوار کلیل بۆ گوێگرتنێکی کاریگەر

ئەو چوار کارامەییەی لێرە فێریان دەبیت بریتین لەمانە ١) گوێگرتن بەوریایی، ٢) وچان، ٣) پرسیاکردن بۆ وەرگرتنی ڕوونکردنەوە، ٤) دارشتنەوە.

## گوێگرتن بەوریایی

خۆت ببەرە پێشەوە و جوان گوێ ڕادێرە لەوەی کەسەکەی دی دەیڵێت. واز لە هەموو ئەو شتانە بێنە تەرکیزت لا دەبەن. مۆبایلەکەت بکوژێنەرەوە و دەنگی کۆمپیتەرەکەت ببڕە. کاتێک دادەنیشیت و قسە دەکەیت لەگەڵ کارمەندێکتدا، بەشێوەیەک مامەڵەی لەگەڵدا بکە وەک ئەوەی گرنگترین کەس بێت لە هەموو جیهاندا.

گوتراوە " وریاییەکی باش، بەرزترین جۆری ستایشە ". کاتێک بەجوانی گوێ دەگریت بۆ کەسێک، کاریگەرییەکی جەستەیی هەیە لەسەریان. لێدانی دڵیان زیاد دەکات، کاردانەوەی ڕووپۆشی سەر پێستیان زیاد دەکات و فشاری خوێنیان زیاد دەکات. کاتێک بەوریایی و بەجوانی گوێ دەگریت بۆ کەسێک، ئەوا وایان لێ دەکەیت

بە چاوێکی ترەوە تەماشای خۆیان بکەن، خۆیان بە گرنگتر و بەبەهاتر دەزانن، ڕێز و باوەڕی خودیان زیاد دەکات.

خۆت ببەرە پێشەوە، سەیری دەموچاوی کەسەکە بکە و چاو ببڕەڕە نێوچاوانی. سەرت بە مانای ڕازیبوون بلەقێنە، زەردەخەنەی بە ڕوودا بکە و گوێگرێکی چالاك بە. با کەسەکەی دی بزانێت کە قسەکانی ئەو گرنگن بۆ تۆ و تۆش گرنگییەکی زۆری پێ دەدەیت.

لە هەمووی گرنگتر، قسەکانی پێ مەبڕە و هیچ کاتێکیش هەوڵی قسەپێبڕینی مەدە. زۆربەی کەسەکان ئەوەندەی خەمی ئەوەیانە تێبینیی خۆیان بڵێن لەسەر شتەکە ئەوەندە بەجوانی گوێ لە قسەکە ناگرن. زۆر بەکەمی دەوەستن هەتا کەسەکە خۆی دەوەستێت یان پشوویەك دەدات بە خۆی.

## پێش وەڵامدانەوە وچان وەر بگرە

دوای ئەوەی کەسەکە لە قسەکردن تەواو بوو، لەجیاتیی ئەوەی یەکسەر تێبینیی خۆت بڵێت و دەست

لەکاتی قسەکردندا وچانێک وەربگرە. بێدەنگبوونێک کە ماوەیەکی سێ بۆ پێنج چرکە بخایەنێت، سێ سوودت بۆ دەگەیەنێت.

١. کاتێک وچان وەردەگریت مانای وایە تۆ بەوردی بیر لەو قسانە دەکەیتەوە کە پێت گوتراوە. ئەمەش وا دەکات بەرێز و بەهایەکی زیاتر سەیری خۆیان بکەن.

٢. لەکاتی وچان وەرگرتندا، خۆت لەوە بەدوور بگرە کە قسە بە کەسی بەرامبەر ببڕیت کە هێشتا ئەو بەتەمای قسەی زیاترە بیکات.

٣. کاتێک وچان وەردەگریت، لەڕاستیدا ئەوە لە قووڵایی قسەی کەسەکەی تر دەگەیت. بەبیرت بێت پەیامەکە تەنها ئەوە نییە، کە کەسەکە دەیڵێت، پەیامە بنچینەییەکەی ئەو قسانەی نەیکردوون دەگوازێتەوە.

باشترین گوێگرەکان " هونەری وچان وەرگرتن " بەکار دەهێنن لە گفتوگۆکانیاندا. ئەم هونەرەش سوودێکی وەهایان دەداتێ کە لە کەسانی دی تێ بگەن و کەسانی دیش لێیان تێ بگەن.

## پرسیار بکە تا ڕوونکردنەوەت پێ بدرێت

هیچ کات وا دامەنێ ئەوەی خەڵکی گووتی هەر ئەوە مەبەستەکەیان بێت. لەجیاتیی ئەوە، ئەگەر هاتوو هەر ناڕوونییەك هەبوو تەنها بڵێ " مەبەستت چییە؟ " ئەم پرسیارە بەهێزترین پرسیارە کە دۆزراوەتەوە بۆ بەڕێوەبردن و ئاڕاستەکردنی گفتوگۆ.

خەڵك هەر لە منداڵییەوە وا ڕاهێندراون هەرکات پرسیاریان لێکرا وەڵام بدەنەوە. هەر کاتێك دەڵێیت " مەبەستت چییە؟ " خەڵك درێژە دەدەن بە قسەکانیان، بەشێوەیەك ماددەیەکی زیاتر دەدات بە تۆ، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕوونتر لێت تێ بگەن.

بە بیرت بێت، کۆنترۆڵ لەدەست ئەو کەسەیە کە پرسیار دەکات، وە کەسی کۆنترۆڵکراو ئەوەیە کە وەڵامی پرسیار دەداتەوە. هەتا پرسیاری زیاتر بکەیت، ئەرێنییانە کۆنترۆڵێکی زیاترت هەیە بەسەر گفتوگۆکەدا. هەتا پرسیار زیاتر بکەیت، زیاتر فێر دەبیت و تێ دەگەیت، وە زانیاری زیاتر بەدەست دەخەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت بڕیارگەلێکی باشتر بدەیت و ببیت بە بەڕێوەبەرێکی باشتر.

## داڕشتنەوە

گوێ بدەرە ئەوەی کەسەکە چی گوت و بە وشەی خۆت دایبڕێژەرەوە. ئەمە پێی دەڵێم " تاقیکردنەوەی ترشی " گوێگرتن. ئەمە ئەو شوێنەیە کە بەڕاستی دەری دەخەیت کە بەجوانی و بەوردی گوێت بۆ قسەکانی ئەو کەسە گرتووە، بەپێچەوانەوەی هەر زەردەخەنە بکەیت و بەس بیرۆکەکانی خۆت مێشکیان داگیر کردبێت.

دەتوانیت شتێکی لەمجۆرە بڵێیت " ڕێم بدە با بزانم بەتەواوەتی مەبەستت چییە..... " دوای ئەوە ئەو شتانە بڵێ کە داتڕشتۆتەوە. بەڵێ، دوای ئەوەی بەڕاستی تێگەشتیت کە کەسەکەی دی بەڕاستی مەبەستی چییە، دەتوانی تێبینییەکانی خۆت بڵێیت.

## گوێگرتن باوەڕ دروست دەکات

پرسیارکردن کلیلی سەرەکی ڕابەرایەتیکردن و پەیوەندییەکی باشە. کاتێك پرسیار دەکەیت هەلی ئەوەت بۆ دەڕەخسێت گوێ لە کەسانی دیکە بگریت، وە گوێلێگرتن باوەڕ دروست دەکات و باوەڕیش لەنێوان دوو

کەسدا دەبێتە هۆی بنیاتنانی لوتکەی ئاستی پێشکەشکردن.

تەنانت گرنگتر لەوەش، گوێگرتن کەسایەتی بنیات دەنێت. هەتا زیاتر گوێ لە خەڵکی بگریت و جەخت لەسەر ئەوە بکەیتەوە کە تۆ دەتەوێت هەوڵ بدەیت بەڕاستی لە ئەوان تێبگەیت، زیاتر گەشە بە خودی خۆت دەدەیت. بۆ گوێگرتن لە کەسانی دی بێ قسە پێ بڕینیان پێویستی بە دیسیپلینێکی زۆر گەورەیە. بەئارامی و ئاسوودەیی گوێ بگرە، بەشێوەیەکی گوێ بگرە وەکوو ئەوەی هەموو کاتی دونیا هی تۆ بێت. بەبیرت بێت کە هەندێك کەس پێویستیان بە کاتێکی زیاترە، بۆ ئەوەی بگەن بە هەندێ خاڵ کە کەسانی دی پێی دەگەن.

کاتێك کارمەندەکان هەست دەکەن کە دەتوانن بەڕاشکاوی و ڕاستگۆیانە قسە بکەن لەبەرانبەر بەڕێوەبەرەکانیان وە بەڕێوەبەرەکانیشیان گشت هەوڵی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی لەوان تێبگەن، ئەوا ئەو بەڕێوەبەرانە پەیوەندی لەگەڵ کەسانێدا دەبەستن کە بەهایان بۆ دادەنێن و گرنگییان پێدەدەن. گوێگرتن

بەوریایی ئامرازێکی بەهێزی هاندانە، کە نەک تەنها کەسانی دی بنیات دەنێت، بەڵکوو وا لە خۆشت دەکات ببیت بە بەڕێوەبەرێک زانیاریی زیاتر و زیاتر بێت. گوێلێگرتن توانادارت دەکات، بۆ ئەوەی بەڕاستی لە هەست و بیرکردنەوەی کارمەندەکانت بگەیت.

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. ئەمڕۆ تەرخان بکە، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێک ویستی قسەت لەگەڵدا بکات، تۆ دەرگاکە دابخەیت و مۆبایلەکە بکوژێنیتەوە و هەموو ئەو شتانە لاببەیت کە دەبنە مایەی لادانت لە گوێگرتنەکە و بەتەنها هەموو تەرکیزت لەسەر ئەو کەسە بێت.

٢. ڕاهێنان لەسەر پرسیارکردنی زیاتر و گوێگرتنێکی وریایانەتر بکە بێئەوەی قسە بە کەسەکە ببڕیت و تێبینیی خۆت بدەیت. گوێگرتن بەجوانی لە کەسانی دیکە باشترین ڕێگایە بۆ بنیاتنانی باوەڕ لەنێوانتاندا، وە باوەڕ سەچاوەی ورە و ئەداکردنێکی بەرزە لە شوێنی کارکردندا.

# بەشی بیست
# پاڵنەری هاوڕێیەتیت لەبیر بێت

کاتێك ڕاپرسی کرا لە کارمەندەکان دەربارەی باشترین بەڕێوەبەر کە هەیانبووە، هەموویان پێکڕا بەیەك شێوە وەڵامیان داوەتەوە " هەستم دەکر کە بەڕێوەبەرەکەم زیاتر وەکوو مرۆڤێك گرنگی دەدا بە من نەك وەکوو ئەندامێکی ستافەکەی.

پاڵنەری هاوڕێیەتی جۆرێکی گرنگی پەیوەندییە کە وا لە کارمەندەکان دەکات باشترین ئاستیان پێشکەش بکەن. لە ئەمڕۆدا دامەزراندنی هاوڕێیەتییەکی ئاستبەرز لەنێوان کارمەندەکان خۆیان و لەنێوان کارمەند و بەڕێوەبەر کلیلی سەرکەوتنی بزنزە. جۆری پەیوەندیی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەند هۆکارێکی گرنگی یەکلاییکەرەوەی ئاستی هاندان و ئەداکردنە لە هەموو دەزگایەکدا. بوون و نەبوونی پاڵنەری هاوڕێیەتی دیاریکەری ئاستی هاریکاری ستافەکەتە کاتێك کار بۆ تۆ دەکەن یان کار لەگەڵ تۆ دەکەن وە لەگەڵ ئەندامانی دیکەی تیمەکەدا.

بەشێوەیەکی بەرفراوانتر، دەتوانین بڵێین سەرکەوتند لە بزنسدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ چەندێتی و چۆنییەتی ئەو هاوڕێیەتییەی کە لەناو بزنسەکەتدا گەشەت پێداوە. شتەکە ئەوە نییە کە تۆ چەند کەس دەناسیت، بەڵکوو چەند کەس بەشێوەیەکی ئەرێنی تۆ دەناسن. هەتا زیاتر خەڵك بتناسێت و کەیفیان پێت بێت، زیاتر کراوە دەبن و خۆبەخشانە یارمەتیت دەدەن لە کار و ژیانتدا.

هەبوونی پاڵنەری هاوڕێیەتی کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەیە لەسەر بەڕێوەبردنی کارەکان لە لایەن کارمەندەکانەوە لە ئاستێکی بەرز، لە بەدەستهێنانی ئەنجامی نایاب و هەستکردن بە گرنگی خۆیان کاتێك کار لەگەڵ تۆدا دەکەن.

## کار بە ڕوونکردنەوە و بیرکردنەوە بکە

بەڕێوەبەرە ناوازەکان ئەوانەن هاوسەنگییان لەنێوان دوو کوالێتیی گرنگدا ڕاگرتووە، ئەوانیش: ڕوونکردنەوە و

بیرکردنەوە. خۆشەویستی و گرنگی خۆیان دەردەبڕن بۆ کارمەندەکانیان و وەکوو ئەندامێکی خێزانەکەیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و بەشێوەیەکیان لێ دەکەن کە هەست بە دڵخۆشی و پارێزراوی بکەن لە کارەکانیاندا. لە هەمان کاتدا زۆر ڕوون و ئاشکرا دەدوێن لەبارەی ئەرك و بەرهەم و لێپرسراویەتییەکانی هەر کەسێك. هەموو کارمەندەکان دەزانن چییان لێ چاوەڕوان دەکرێت، بۆ ئەوەی کارەکانیان بەجوانی بەڕێوە بەرن.

پاڵنەری هاوڕێیەتی لە سێ "C" پێکدێت: "بیرکردنەوە Consideration"، "گرنگیپێدان Caring" و"ڕەوشت بەرزی Courtesy". ئەمانە ڕەفتاری بەڕێوەبەرێکی نایابە بەرانبەر هەر کەسێك کە کاری بۆ دەکات.

کاتێك کار بە تێڕامان بکە کە پرسیار بکەیت لە ستافەکەت دەربارەی خۆیان، وە بەتایبەتیش دەربارەی خێزانەکانیان و ژیانی تاکەکەسی خۆیان. کاتێك گرنگی دەدەیت بەو شتەی بەو کارەی کە لە دەرەوەی ژیانی کارکردنیاندا دەیکەن، ئەو کات تۆ دەری دەخەیت کە

گرنگییان پێ دەدەیت وەکوو ماکینێک. کاتێک پرسیار دەکەیت دەربارەی ژیانی کەسێتی کارمەندەکانت و بەوریایی گوێ دەگریت بۆ وەڵامەکانیان، ئەو کات هەست بە گرنگ و بەنرخی خۆیان دەکەن و لە ئەنجامدا زیاتر کەیفیان بە تۆ دێت و ڕێزی زیاترت لێ دەگرن.

## خەمی ستافەکەت بخۆ

کاتێک ئەم خەمخواردن و گرنگیپێدانەی خۆت پیشان دەدەیت کە ئەندامێکی ستافەکەت پرسیارێکت لێ دەکات یان کێشەیەکت پێدەڵێت و تۆش دەمودەست هەوڵی ئەوە دەدەیت لە کێشەکەیاندا یارمەتییان بدەیت.

بۆ نموونە خۆم هەموو جارێك بە کارمەندەکانم دەڵێم " منداڵەکان بە پلەی یەکەم دێن "، لەم قسەدا من مەبەستم ئەوەیە ئەگەر منداڵەکانیان کێشەیەکیان هەبوو یاخود پێویستییەکیان هەبوو ئەوە دەتوانن یەکسەر کارەکە بەجێ بهێڵن و بڕۆن بەدەم منداڵەکانیانەوە بێ ئەوەی پارەیان لێ دابشکێندرێت یاخود کاتەکە قەرەبوو بکەنەوە. بۆ نموونەی تازە بوون بە دایک ئەم ڕێگایە

باشترینە کە بەڕێوەبەر دەتوانێت بەکاری بهێنێت بۆ پیشاندانی ئەوەی خەمی کارمەندەکانت دەخۆیت و خەمی گرنگترین پارچەی ژیانیان دەخۆیت.

کاتێک پرسیار لە کارمەندەکانت دەکەیت دەربارەی خێزانەکانیان و ژیانی تایبەتی خۆیان، وە هاوسۆزی خۆت دەردەبڕیت بۆ ئەو ئاستەنگانەی کە ڕووبەڕووی بوونەتەوە، ئەوا ئەو کات تۆ دەری دەخەیت کە بەڕاستی خەمیان دەخۆیت و گرنگییان پێ دەدەیت. هەروەها بە چەند ڕێگەیەکی دی دەتوانی گرنگیپێدان و خەمخواردنی خۆت بۆ کارمەندەکانت دەرببڕیت، بۆ نموونە بە سایتشکردنی ئەو دەستکەوت و بگرە ئەو جلوبەرگەشی کە هەیەتی.

## یاسای ئاڵتوونی بەڕێوەبەرێتی بەکار بهێنە

کاتێک ڕەوشتبەرزیت نیشان دەدەیت بەرانبەر ستافەکەت کە ڕێز بۆ هەموو کەسێک دادەنێیت، وە کاتێکیش پارێزگاری لە ڕوشتبەرزی خۆت دەکەیت کە لەژێر فشاردایت و شتێکی نەخوازراو ڕوویداوە،

یاخود کارمەندێك کێشەیەکی هەیە، هەستی ئاسوودەی و پارێزراوی لە لای کارمەندەکەت زیاد دەکەیت. کاتێك ڕەوشتبەرز دەبیت بەرامبەر بە خەڵکی، وورەیان زیاتر دەکەیت و زیاتر هانیان دەدەیت.

کلیلی بەکارهێنانی پاڵنەری هاوڕێیەتی ئەو کاتە دەبێت کە " یاسای ئاڵتوونی بەڕێوەبردن " بەکاربهێنیت. بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کارمەندەکانت بکە کە حەز دەکەیت لەسەروو خۆتەوە بەهەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵ بکرێت. بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کارمەندەکانت بکە وەکوو ئەوەی هاوپیشەیەکت یان کڕیارێکت بن، یان وەکوو پارچەیەکی بنچینەیی گرنگی کۆمپانیاکەت.

کاتێك جاك ویڵچ سەرۆکی کارەبای گشتی بوو، هانی بەڕێوەبەرەکانی دەدا بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کارمەندەکانیاندا بکەن وەکوو ئەوەی لە چەند ساڵی داهاتوودا کارمەندەکان دەبن بە بەڕێوەبەری ئەمان. لەبەر ئەو سروشتە کێبڕکێکارانەی کە لە بواری کارەبای گشتیدا هەبوو، بەرزبوونەوە لە پلەدا شتێکی جیابوو، وە یاسای بوو گەر کارمەندەکەت لەچەند ساڵی داهاتوودا ببێت بە

بەڕێوەبەرت. ئەم توانای شوێن گۆڕانەش وای دەکرد لە گشت ئەو کەسانەی کە لە کاروباری گشتیدا کاریان دەکرد بەشێوەیەك مامەڵە بکەن کە ئەگەر شوێنەکانیان گۆڕا ئەوانیش بەهەمان شێوە مامەڵە بکەن.

## باشتری کاتی ژیانی کارکردنت

باشترین کاتەکانی ژیانت ئەو کاتە ئەزموون دەکەیت کە لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەتدا گونجاو بیت، وە خراپترین کاتەکانی ژیانی کارکردنت لەو کاتانەدا ئەزموون دەکەیت کە کێشەت هەیە لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەتدا و ناگونجێن. کاری تۆ وەکوو بەڕێوەبەرێك دڵنیابوونەوەیە لەوەی لەگەڵ هەموو کارمەندەکانتدا دەگونجێیت و ئەوانیش لەگەڵ تۆدا دەگونجێن.

بەکارهێنانی یاسای ئالتوونی بەڕێوەبردن لەگەڵ کارمەندەکانتدا شتێکی ئاسانە، دەتوانی هەندێك پرسیاری سادەی وەکوو ئەمانە بکەیت:

- چ شتێك وا لە من دەکات هەست بکەم باشترینم لە کاتی کارکردنمدا؟ چ شتێك لە کارەکەمدا دڵخۆش و ئاسوودە و تاسەمەند و پڕ جۆشوخرۆشم دەکات؟

- کێن ئەو بەڕێوەبەرانەی کە هەم بوون، وە چ شتێکیان وتووە و کردووە کە وا بکەن دڵخۆش بم لە کارەکەمدا؟ چۆن دەتوانم کەشێکی ئەرێنی هەمان شێوە دروست بکەم لەگەڵ ئەوانەی کارم لەگەڵ دەکەن؟

.ئەو پەیوەندییە نموونەییە کامەیە کە حەز دەکەم لەگەڵ هاوپیشەکانمدا هەم بێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە هەر شتێك بوو، وەکوو ڕێبەرێك بەکاری بهێنە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەندامانی ستافەکەت. شتگەلێك بکە و بڵێ لەگەڵ کارمەندەکانتدا کە ئەگەر شوێنەکانتان گۆڕا ئەوانیش بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ تۆ بکەن؟

## ڕاهێنانی کردارەکی

١. هەر ڕۆژێك، هەر لە یەکەم بەرکەوتنتەوە لەگەڵ کارمەندەکانت پرسیاریان دەربارەی خۆیان و ژیانی

کەسێتیان و خێزانەکەیان لێ بکە. بەوردی گوێ لە وەڵامەکانیان بگرە و سەرت بلەقێنە و زەردەخەنە بکە، هاوسۆزیی و گرنگیپێدانی خۆتیان نیشان بدە. تەنها دوای ئەم شتانە دەست بکە بە قسەکردن لەگەڵی دەربارەی کار.

٢. لە هەموو حاڵەتەکاندا کار بە یاسای ئاڵتوونی بەڕێوەبردن بکە. کاتێك قسە دەکەیت لەگەڵ کارمەندەکات وا دابنێ ئەو لە ماوەیەکی داهاتوودا دەبێت بە بەڕێوەبەرت و تەنها تۆش ئەم شتە دەزانی.

# بەشی بیست و یەک
# هاندانی جادوویی دروست بکە

وەکوو بەڕێوەبەرێك، سەرکەوتنەکانت بە دروستکردنی کەسانی ناوازە لە کەسی ئاساییەوە دیاری دەکرێت. ئامانجی تۆ دروستکردنی تیمێکی ورەبەرزی براوەیە کە باشترین ئاستی خۆیان پێشکەش دەکەن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی دەزگاکە.

حەوت ڕێکار هەیە دەتوانی گشت ڕۆژێك بەکاریان بهێنیت بۆ بەرزکردنەوەی ورە و هاندانی خەڵکی بۆ پێشکەشکردنی باشترین ئاستیان و بەکارهێنانی ئەو لە ٥٠٪ بەکارنەهێندراوەیە کە کارمەندەکان بەیانی دەچن بۆ کار لەگەڵ خۆیان دەیبەن و ئێوارە دووبارە بە بەکارنەهێندراوی لەگەڵ خۆیاندا دەیبەنەوەماڵەوە.

(هەر یەکێك لەم ڕێکارانە بەوردی لە کتێبی "Engagement Full" دا ڕوون کراوەتەوە)

١. زەردەخەنە بکە: کاتێك بۆ یەکەمجار لە ڕۆژێکدا کەسێك دەبینیت، زەردەخەنەی بەرانبەر بکە. ڕێك سەیری دەموچاوی کەسەکە بکە، زەردەخەنە بکە و بوەستە و بەئاشکرا دەری بخە کە دڵخۆشی بە بینینیان. تەنها ١٣ماسولکەی دەوێت بۆ زەردەخەنەکردنێك بەڵام ١١٢ ماسولکەی دەوێت بۆ دەموچاوگرژکردنێك. لەبەر ئەوە زۆر ئاسانترە هەموو ڕۆژێك زەردەخەنە بکەیت بەرانبەر کەسێك، وە دڵخۆشیان دەکات و ورەیان پێ دەبەخشێت.

٢. پرسیار لە کارمەندەکان بکە: قسەیان بۆ بکە، پرسیاریان لێ بکە کە ڕۆژەکەیان چۆن دەڕوات و چی دەگوزەرێت. کاتێك بەڕاستی گرنگی خۆت دەردەخەیت بۆ کارمەندەکانت، ئەوا زیاتر هەست بە گرنگی و بەنرخی خۆیان دەکەن و لەناخەوە دەیانەوێت کارێکی باش ئەنجام بدەن و دڵی تۆش خۆش بێت.

٣. گوێیان لێڕابگرە: بەوردی گوێ بگرە کاتێك کەسێك قسەت بۆ دەکات. کاتێك بەجوانی گوێ بۆ کەسێك دەگریت و قسەکانی پێ نابڕیت، ئەم ڕەفتارەت وایان لێدەکات هەست بە بەنرخی خۆیان بکەن و ڕێزی خودییان

بەرز ببێتەوە. گوێ بۆ گیرانت لە لایەن بەڕێوەبەرەکەتەوە دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆنی ئیندرۆفین لە لەشی کەسەکەدا، کە وایان لێدەکات خۆیان بە دڵخۆشتر و باشتر بزانن. کاتێك گوێ دەگریت، دڵنیابەرەوە لەوەی سەرت ڕادەوەشێنیت و زەردەخەنە دەکەیت بە ڕووی کەسەکەدا و بەجوانی سەیری نێوچاوانی دەکەیت. وا پیشان بدە کە هەر شتێك ئەو کەسە دەیڵێت زۆر گرنگە بۆ تۆ. گوێگرتنێکی چالاك تەنها چەند خولەکێك لەکاتەکانت دەگرێت ڕۆژانە، بەڵام کاریگەرییەکی بەهێز و ئەرێنی هەیە لەسەر چۆنییەتی ئەنجامدانی کار لە لایەن کارمەندەکانەوە.

٤. بەڕەوشت بە: هەموو دەم بەڕەوشت، بە ئەدەب و بەڕێز بە کاتێك قسە دەکەیت بۆ ئەندامانی ستافەکەت. بەشێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵ بکە وەکوو ئەوەی ئەوان بەهرادار و زیرەك و بەتوانا بن. خۆت ببە پێشەوە و چاو ببڕە نێوچاوانیان، وەکوو ئەوەی هیچ کارێکت نەبێ لەم جیهانەدا جگە قسەکردن لەگەڵ ئەوان.

٥. سوپاسیان بکە: بۆ هەر شتێك دەیکەن، بچووك بێت یان گەورە، سوپاسی ئەنجامدەرەکەی بکە. سوپاسیان بکە گەر لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبوون لە کۆبونەوەدا، وە هەروەها بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەرکێك، بۆ پێدانی پارچەیەك لە زانیاری وە بۆ هەر شتێکی تر کە بەشێك بێت لە کارەکەیان. دەربڕینی ستایشی خۆت بەرانبەر خەڵکی و سوپاسکردنیان بەرانبەر هەر شتێك کە وتویانە و کردویانە، ڕێگایەکی ترە، بۆ ئەوەی وا لە کارمەندەکانت بکەیت هەست بە گرنگی و بەنرخی خۆیان بکەن.

٦. بەردەوام زانیارییان بدەرێ: زانیارییان بدەرێ دەربارەی کۆمپانیا و بزنز و بەتایبەتی هەر شتێك کاریگەری لەسەر کارەکەیان و پارێزراوی کارەکەیان هەبێت. ڕازیترین کارمەندگەل لە کارەکەیان ئەوانەن کە دەڵێن هەموو شتێك دەزانن و هەموو شتێکیان بۆ ڕوونکراوەتەوە و ئاگایان لە هەر شتێکە کە لە دەوروبەریان ڕوودەدات کە کاریگەری هەیە لەسەر کارەکەیان.

٧. هانی بەرەوەپێشچوونێکی بەردەوام بدە: هانی کارمەندەکانت بدە، بۆ ئەوەی بیرۆکەیان هەبێت کارەکانیان بە شێوەیەکی باشتر ئەنجام بدەن یان کۆمپانیاکە بەرەوپێشەوە ببەن. یابانییەکان لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ئابووریی خۆیان بە سیستەمی ( کایزێن ) بنیاتنایەوە کە بە مانای " بەرەوپێشچوونێکی بەردەوام دێت ". ئەوان یارمەتی هاوپیشە و هاوکارەکانیان دەدا لە هەر ئاستێکدا، بۆ دۆزینەوەی هۆکارێکی بەرەوپێشبردن بە گەورە و بچووکیەوە لە بوارەکەی خۆیاندا.

کاتێك ئەم بیرۆکانە بەکار دەهێنیت و دەیانکەیت بە ڕێبەری خۆت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هاوپیشەکانت، سەرت دەسوڕمێ لەوەی چەندێك کاریگەرییان هەبووە و چەند تیمەکەت باش بووە لە بەدەسهێنانی ئەنجامی باشتر.

تواناکانت بۆ هاندان، سروشپێدان و هەڵبژاردنی باشترین ئاستی ئەداکردن بۆ ئەو کەسانەی کە ڕاسپاردەی تۆ کراون، لە هەر هۆکارێکی دیکە زیاتر دیاریکەری سەرکەوتنەکانتە وەکوو بەڕێوەبەرێك. بەختێکی باش!

# دەربارەی نووسەر

براین ترەیسی ڕاهێنەر، ڕاوێژکار، ڕابەری سیمینار و قسەکەرێکی پرۆفیشناڵە، وە سەرۆکی کۆمپانیای نێودەوڵەتیی برایان ترەیسی یە بۆ ڕاهێنان و ڕاوێژکردن. برایان بە تەنها خۆی گشت ڕێگایەکانی بڕیووە هەتا سەرکەوتن. لە ساڵی ١٩٨١دا دەستی کرد بە وتنەوەی بنچینەگەلێك کە لە بواری بازرگانی و فرۆشتندا کە بەدەستەکانی خۆی کوتابوونی. ئەمڕۆ کتێبەکان و تۆمارە دەنگی و ڤیدیۆیەکانی کە لە ٥٠٠ دانە زیاترن بە ٣٨ زمان و لە ٥٥ وڵات بەردەستە. برایان نووسەری زیاتر لە ٥٠ کتێبی پڕفرۆشە. ساڵەنە وانە بە زیاتر لە ٢٥٠ هەزار کەس دەڵێتەوە و وە مەشقی بە زیاتر لە ١٠٠٠ دەزگا و ڕێکخراو کردووە. لە پیشەکەیدا وانەی بە ٥ ملیۆن کەس وتووەتەوە لە ٥٨ وڵاتی جیاوازدا. گرنگترین تایبەتمەندیی برایان ئەوەیە کە چی وتبێت و نووسیبێت لە ژیانی ڕابردووی خۆیدا بەرجەستەی کردووە.

برایان ترەیسی

هەرێمی کوردستانی عێراق
Kurdistan regional - Iraq
Council of Ministers



سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
کتێبخانەی گشتی سلێمانی
بەشی سپاردن
ژمارە
رۆژ / کوردی ٢٧١٩

رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
المكتبة العامة/ السليمانية
ژمارە ٢٦٤٢
بەروار ٢/ ٧/ ٢٠١٩

بۆ/ کتێبخانەی بەختیاری

بابەت / ژمارەی سپاردن




بەپێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣

ژمارەی سپاردنی( ١٨٤٧ ) ی ساڵی ٢٠١٩ تەرخانکراوە بۆ کتێبی (هاندان) کە لە وەرگێڕانی ( رۆژگ ئومێد )ە ، بە تیراژی ( ١٠٠٠ ) دانە ، کتابەتەکەی (گەنجەپێدانی مرۆیی)ە بە مەرجێك (٥) دانە لە کتێبەکە بۆ بەشی سپاردن رەوانە بکرێت.

لەگەڵ رێزماندا




ئالان محمد رؤوف
بەڕێوەبەر

تێبینی:

١- مەحسوبلەی سپاردن بەم شێوەیە لەسەر کتێبەکە چاپ بکرێت، لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن ( ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە.
٢- هەر چاپخانەیەك پابەند نەبێ بە ناردنەوەی (٥) دانە لە کتێبەکە، ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.
٣- ئەم نووسراوە سکان بکرێت وەلە کۆتایی کتێبەکەدا دابنرێت .

وێنەیەك بۆ
- نووسینگەی سپاردن

slemanylibrary@yahoo.com
www.slemanylibrary.com
ژمارەی تەلەفۆن ٣١٠٢٧١٦

# MOTIVATION

## BRIAN TRACY

یەکێك لە گرنگترین لێپرسراوێتییەکانت وەکوو بەڕێوەبەرێك هاندانی کارمەندەکانتە بۆ پێشکەشکردنی باشترین ئاستیان. ئەو بەڕێوەبەرانەی ژینگەیەکی پڕ لە وزە و خەڵاتکردن دروست دەکەن دەبنە هۆی کەمکردنەوەی کەمتەرخەمیی کارمەندەکان و لە هەمان کاتدا بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و کوالێتیی بەشێوەیەکی بەرچاو.

لەم کتێبەدا، شارەزای بواری سەرکەوتن بۆ چەندین دەیە برایان ترەیسی ٢١ ڕێگای خێرا و بەهێزی داناوە بۆ زیادکردنی کاریگەریی هەر کەس و گرووپێك. ئەو دەری دەخات کە چۆن:

دڵنیابیت لەوەی کارمەندەکانت بەسۆزن بۆ کارەکەیان، ڕکابەرییان بکەیت بە پێدانی ئەرك و بواری فراوانکردنی تواناکانیان ، ڕازیکردنیان بەوەی کە سەربەخۆن و لەهەمان کاتیشدا بەشێکن لە گشتی، کەمکردنەوەی ترسیان لە شکست و زیادکرنی ئارەزوویان بۆ هەوڵدان، لابردنی ڕێگرەکانی بەردەمیان و بەدەستخستنی ئەو تێبینییانەی بۆ سەرکەوتن پێویستیانە و زۆری دیکەش.